


زنجیرەی ١٠٠ کتێبی کوردی
ژمارە ( ٢٥ )



# دەوڵەتی دۆستەکی لە کوردستانی ناوەڕاستدا



نوسینی : عبدالرقیب یوسف
وەرگێڕان و کورت کردنەوەی : ابوبکر علی

چاپی یەکەم

١٩٩٨ ز ١٤١٩ ک

زنجیرەی (١٠٠) کتێبی کوردی
ژمارە (٢٥)

# دەوڵەتی دۆستەکی

## لە کوردستانی ناوەراستدا

نووسینی
عبدالرقیب یوسف
وەرگێران و کورت کردنەوەی
ئەبوبەکر عەلی

چاپی یەکەم

١٤١٩ک ١٩٩٨ز

ناوی کتێب: الدولة الدوستكية في كوردستان الوسطى
نووسینی : عبدالرقيب يوسف
وەرگێڕان و کورت کردنەوەی : ئەبوبەکر عەلی
ساڵی چاپ: ١٤١٩ك ١٩٩٨ز
تیراژ : ( ٢٠٠٠ ) دانە

ژمارەی سپاردن : ( ٥٣ ) ١٩٩٨
چاپی یەکەم
چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

# چەند وتەیەکی پێویست

ناحەزانی ئێمەی کورد، بەتایبەتی لەم چاخەدا لە دوای دروست بوون وسەرهەڵدانی دەوڵەتە نەتەوەیی یەکانی ناوچەکە، لە زۆر کاتدا هەوڵیان داوە وەک گەلێکی بێ مێژوو بێناسنامە بمان ناسێت. بەڵکو هەندێجار بە شێوەیەکی زۆر سەر سوڕهێنەر نکوولی لە زمان وفەرهەنگ وبوونی سەربەخۆمان کراوە !!. هەوڵیان داوە رۆڵەکانی نەتەوەی کورد بەرامبەر مێژوو رابوردوویان بەدبین بکەن. ویستوویانە بیسەلمێنن گەلی کورد بەتایبەتی لە چاخە ئیسلامیەکاندا خاوەنی رۆلێکی وانەبووە. بۆ ئەمەیش هەوڵی سڕینەوەی سیمای رەمزی کوردییە مێژوویەکانیان داوە. نکوولیان لەوە کردووە کە کورد رۆژێ لەرۆژان خاوەنی قەوارەیەکی تایبەت بە خۆی بووبێ.

ئەمە لە کاتێکدا دەوڵەتی ئەییوبی کورد زیاتر لە (١٧٠)سەدوحەفتا ساڵ فەرمانڕەوایی بەشێکی بەرفراوانی جیهانی ئیسلامیو رێبەرایەتی ئەو جیهانەی کردووە، بەدەر لەوەش بە درێژایی ئەو چاخانە تا نیوەی دووەمی سەدەی (١٩)کورد زیاتر لە (٥٠)میرنشین و حکومەتی دروست کردووە، کە ئەگەر باری کورد لە رووی خۆ بەڕێوەبردن وبوونی قەوارەی جۆراوجۆرەوە لە ژێر سایەی دەوڵەت وئیمپراتۆریەتە ئیسلامیەکاندا سەرەڕای هەموو ئەو لادان وداڕوخاویەی تووشی بوون، هەڵسەنگێنین بەراوردی بکەین لەگەڵ باری کورد دوای ئەوەو لە سایەی دەوڵەتە نەتەوە پەرست و سکیولەریستەکانی کوردیان تیا دەژی، ئەوا بێسێو دوو دەگەینە ئەو قەناعەتەی کە کورد جاران دەیان جار حاڵی باشتر بووە. چونکە لەسایەی دەوڵەتە هاوچەرخە نەتەوەییەکاندا نەک هەر هیچ جۆرە قەوارەیەکی خۆ بەڕێوەبردنی پێ رەوا نەبینراوە بەڵکو وەک زمان وفەرهەنگ و بوونی نەتەوەیش نکوولی لێکراوە، دیارە مەبەستی ناحەزانی کورد لە پیشاندانی مێژووی کورد بەوەی مێژووی شکستیەکی بەردەوامە، قووڵکردنەوەی مەسەلەی بێقەوارەیی کورد. مەبەستیان بووە کورد گرێی خۆ بەکەم زانینی بۆ دروست ببێو نەتوانێ سەر بەرز بکاتەوە.

لە راستیشدا ئەوە بۆ کورد بووە بە گرێو بەدەستیەوە دەناڵێنێ. ئەوەی جێگای داخیشە لە هەندێ برگەی مێژوویدا. و وەک کاردانەوەیەک بۆ ئەو بارە

ناهەمواره‌ی تووشی کورد هاتووەو لە ژێر کاریگەری شەپۆلێکی فیکری دیاریکراودا هەندێ لە خەڵکی خۆشمان بەشدارییان لە شێواندنی مێژوو بەدبین کردن و نائومێدکردنی رۆڵەکانی نەتەوەکەماندا هەبووە بەڵام ئێستا بە حوکمی نیشتنەوەی کەف و کوڵی تەوژمە فیکرییەکەو کامڵتر بوونی بیری نەتەوەیی وسەر هەڵدانی بزاڤێکی ئیسلامی پەرەسەندوو لە کوردستاندا، جۆری تێڕوانینەکان بۆ دوێنێی کورد گۆڕانی باشیان بەسەردا هاتووە . هەوڵ دەدرێ ئاوڕێکی جدی تر بەلای مێژوودا بدرێتەوەو لاپەڕەکانی هەڵبدرێتەوەو شانازییەکانی زیندوو بکرێتەوەو سوود لە هەوڵ و شکستیەکانی وەربگیرێت . ئەمەش ئاماژەیەکی دڵخۆشکەرە، چونکە وەک روونە هوشیاری مێژوویی رۆڵێکی گەورە دەگێڕێ لە پێکهێنانو خوڵقاندنی هوشیاری ئیسلامیو نەتەوەیی لە کوردستاندا . بەڵام بۆ ئەوەی مێژوو ئەو رۆڵە بگێڕێت دەخوازێت کە باس و خواستەکانی لە چوار چێوەی مێژوونووس و روناکبیران و لێکۆڵینەوە زانستیەکان بێتە دەرەوەو بەشداری لە داڕشتنی عەقڵی جەماوەرە گشتیەکەدا بکات . بە جۆرێ لە هەوڵدان بۆ دیاریکردنی ناسنامەو پارێزگاری لێکردنیو هەست بە خۆکردندا، مێژوو ببێتە کەرەسەی رۆشنبیریەکی میللی وجەماوەری . لە پاڵ لێکۆڵینەوە زانستی و ئەکادیمیەکاندا کە مەرج وزمانی تایبەتی خۆیان هەیە . لاپەرکانی مێژوومان بە زمانێکی سادەو بە کورتی وبە پوختی بخرێتە بەردەم جەماوەر . بۆ ئەوەی لە هەر ئاستێکی فیکریو رۆشنبیریدا بن بتوانن سوودی لێ وەر بگرن وشارەزاییەکی گشتی لە مێژووەکەیاندا پەیدا بکەن . تەنانەت ئەو بەشەش لە جەماوەر کە توانای خوێندنەوەی نیە ، هەوڵ بدرێ لە رێی دەزگاکانی بینین و بیستنەوە ئەو بۆشاییەیان بۆ پڕ بکرێتەوە. ئەم نامیلکەش بۆ ئەوئامانجە هاتۆتە چاپ کردن . وەرگێڕان و کورتکردنەوەی لێکۆڵینەوەیەکی (٨٧٢)لاپەڕەیی بە مەبەستی جەماوەریکردنی زانیاریەکانی ناویو، بەشداری کردن لەدروست کردنی ئەو هۆشیارییەی ئاماژەمان پێکرد لە ناو جەماوەری خەڵکداو کەم کردنەوەی گرێی خۆ بە کەم زانین . هیوادارم جێگای رەزامەندی خوێنەرانی بێت .

**ئەبوبەکر عەلی**

## لەباتی پێشەکی

# (کوردو فەرهەنگی دەوڵەتداری).. ئاورێکی مێژوویی

کورد یەکێکە لەگەورە ترین ئەو نەتەوانەی جیهان کە تائێستاش خاوەن قەوارەی سەربەخۆی خۆی نی یە.

دیارە ئەم حاڵەتەش بێ هۆکار نی یە،مێژوونوسو ڕووناکبیری کورد زۆربەی جار دەیگێڕنەوە بۆ هۆکارێکی گرنگ کە ئەویش ئەوەیە کورد لەمێژوودا خاوەنی قەوارەی سەربەخۆی خۆی نەبووە تا لەچاخی نوێشدا بەپشت بەستن بەوپێشینەیە لەفەرهەنگی دەوڵەتداری، بتوانێت هەڵسێتەوەو خۆی بگرێتەوە. واتە نەبوونی قەوارەیەکی مێژوویی سەربەخۆ وای لەکورد کردووە فەرهەنگی دەوڵەتداریی لەلای بەگوێرەی پێویست گەشە نەکاتو بایەخی بوونی قەوارەی سەربەخۆ بەو ئەندازەی پێویستە لە گوتاری سیاسیو بەرنامەی خەباتی سیاسیو نەتەوەییدا ئامادە نەبێت.

مێژوونووسو روناکبیری کورد ئەوەندەی پێی کرابێت لەهەوڵی گەڕان بەدوای رەچەڵەکو نەژادی نەتەوەکەیدا بووە ویستوویەتی ئەوە ساغ بکاتەوە کەئایا کورد لەقۆناغە مێژووییە جۆراو جۆرەکانیدا توانیویەتی قەوارەی سەربەخۆی پێکبهێنێ؟

لەم رووەوە زۆر لەمێژوونوسان هاتونەتە سەر ئەو رایەی کە(مادەکان) باوکە گەورەی کوردنو لەقولاییەکی مێژووی دوریشدا کورد دەوڵەتی مادی دروستکردووە. مێژوونوسانی کوردیش پشتیوانییان لەم رایە کردووەو هەوڵیان داوە لەڕێی لێکۆڵینەوەکانیانەوە ئەمە ساغ بکەنەوەو لەڕێی ئەمەوە وا لەکورد بکەن هەست بکات گەلێکی ڕەسەنو دێرینی ناوچەکەیەو لە مێژووشدا دەوری خۆی بینیوەو بەشداری

دروستکردنی شارستانی‌یەتی ڕۆژهەڵاتو مێژووی ئەو قۆناغەی ئەو ناوچەیەی کردووە؟[1]

بەڵام مێژوونووسانی هاوچەرخی کورد -ئەوەندەی من ئاگام لیێ بێت- کەمتر بەلای ئەوەدا چوون کورد لەدوای هاتنی ئیسلامو لەچاخە ئیسلامی‌یەکاندا توانیبێتی بەجۆرێ لەجۆرەکان خاوەنی قەوارەی سەربەخۆی خۆی بێت، دەوری بینیبێتو دەوڵەتی دروستکردبێتو شوێنو پلەو پایەی تایبەت بەخۆی هەبوو بێت.

دیارە مێژوونوسانی کورد ئاماژەیان بەبوونی زیاترلە(٥٠)میرنشینی کوردی لەچاخەکانی ئیسلامیی‌دا کردووە. کە هەریەکەو کەم تا زۆر خاوەنی نیمچە سەربەخۆییان بوون.بەڵام وەک وتمان کەمتر باسی بوونی دەوڵەتی کوردیان خستۆتە بەرباسو لێکۆڵینەوە.

بەسەرنجدانێکیش دەتوانین بگەینە ئەو راستیەی کە مەسەلە ئایدۆلۆژیەکە لەو بوارەدا ڕۆڵی نەگەتیفانەی گێڕاوە. لەزۆر کاتو شوێندا وای لە روناکبیری کورد کردووە، بەئەندازەی پێویست بابەتیانە لێکۆڵینەوەکانی ئەنجام نەدات، ئەمەش بەحوکمی ئەوەی زیاتر لەنیو سەدەیە فەرهەنگو بیری چەپ توانیویەتی شوێنەوار لەسەر ناوەندە رۆشنبیریەکە بەجێ بهێڵێت.

مێژوو واقع لە دیدە فەلسەفیو فکرییەکەی خۆیەوە هەڵبسەنگێنێتو لێکبداتەوە.[2] کەبەرەنجامەکەی خۆڵقاندنی جۆرێ لەگرێی هەست بەخۆکەم سەیر کردن بوو.

ئەم شەپۆلە فکریو فەلسەفیەش بەتایبەتی پێش هەرەسهێنانی بلۆکی رۆژهەڵاتو پاشەکشێ کردنی لەسەر ئاستی جیهانیدا، ئەوەندەی بارە سیاسیو کۆمەڵایەتی‌یەکە ڕێگای پێ دابێت، دژی فەرهەنگو ژیاری ئیسلامیی ئیشی

---

[1]) دیارە لێکۆڵینەوە لە مێژووی کورد لە پێش ئیسلامدا کارێکی پێویستەو دەبێ جێگای بایەخی گەورەی مێژوونوسان بێت بۆ ئەوەی ناسیونالیستە توند ڕەوەکانی ئەتەوە دراوسێکانیش حاڵی بکرێن کەکورد نەتەوەیەکی دێرینو رەسەنی‌ناوچەکەیە.

[2]) دیارە ئێستا چەپی کوردستان- باڵێکی بچووکی توندڕەوی نەبێت-وازی لەو بیرکردنەوەیە هێناوەو حزبو رێکخراوی کوردستانیین بەواتایەکی تر چەپی نەتەوەیین.

کردووەو لەهەوڵی سڕینەوەی کارایی‌و شوێنەواری ئەو فەرهەنگەدابووە.

لەم شاڵاوەشدا مێژوو ئامرازێکی ڕاپەڕاندنی دەستی بووە. لەڕێی خوێندنەوەیەکی کاڵو کرچو ماتریالی‌و نابابەتیانەی مێژووەوە هەوڵ دراوە نەوەی نوێی کورد بەسوود وەرگرتن لەو ستەمو چەوساندنەوە نەتەوەیی‌و مرۆڤایەتیە قورسەی لەژێر باریدا ناڵاندویەتی، لەناقار ئیسلامدا وەک مێژوو ژیاری‌و ڕێبازو ئێستاو ئایندە ڕەشبین‌و بەدبین بکرێت‌تەنانەت بۆ ئەم مەبەستە گوێ بەوە نەدراوە داستان هەڵبەستری‌و ڕاستیەکان ئاوەژوو بکرێنەوە.[١]

دیارە بەدبین کردنی نەوەی نوێی کورد لەمێژووەکەی جگە لەم ئامانجە، ئامانجی تری ئایدۆلۆژیشی لە دواوە بووە. کەئەویش بریتی بووە لەلێدانی بیری نەتەوەیی کوردی. چونکە چەپ بەتایبەتی لەو قۆناغەدا زۆربەی ئەنتەر ناسیونالیستی بووەو لەو دیدەوە سەیری نەتەوایەتی کردووەوبە مۆدیلی چاخی سەرمایەداری‌و ئاستەنگی بەردەم گەشەکردنی کۆمەڵگای داناوە، یان هیچ نەبێت بەئاستەنگی بەردەم بزوتنەوە سیاسی‌و کۆمەلایەتیەکەی خۆی زانیوەو لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی چینی کرێکار دژوارە، چونکە مەسەلەی خەباتی چینایەتی‌و جیهانی بوونی مەسەلەی کرێکاران لەخانەی یەکەمی تێکۆشانی بزاڤی چەپدایە. لەبەر ئەوەی مێژووش ڕەگەزێکی گرنگی بوونی نەتەوەو هەستو سۆزی نەتەوایەتی‌یە، کەواتە لێدانی مێژوو، لێدانی پایەیەکی بەهێزی بیری نەتەوایەتی‌یە.

هەر بۆیە سەیر دەکەین لەچلەکاندا لەناوەندە چەپەکەدا مشتو مڕ لەسەر ئەوە پەیدا بووە کە ئایا کورد نەتەوەیە یان نەء؟ئایا ڕەگەزەکانی نەتەوەی تیایە یان تیای نی‌یە؟ [٢]

---

[١] شێواندنی مێژووی حکومەتەکەی( شێخ مەحمود )و شۆڕشەکەی( ١٩٢٥ )ی (شێخ سەعیدی پیران)و زۆربەی تری لەم بابەتە نموونەی‌ئەم ڕاستیەن کە ئەو ڕاپەڕین‌و شۆڕشانە هەندێ جار دراونەتە پاڵ بێگانەکان، ئێستاش هەندێ رادیۆو دەزگای ڕاگەیاندن هەیە مامەڵە کردنی لەگەڵ ژیارو فەرهەنگی ئیسلامیی هەر داستان هەڵبەستن‌و چەواشە کاری‌یە.

[٢] ئەو مشتو مڕانە لەناو ڕیزەکانی پارتی کۆمۆنیستی عێراقی ئەو کاتەدا بووە، لە کوردەکان بنکەیەکی فراوانی ئەو پارتەیان پێکهێناوە.

دیاره ئەم مشتومڕەش لەژێر کاریگەریو لەروانگەی نوسراو ەکانی ڕیبەرانی چەپی وەکو (ستالین) دەربارەی مەسەلەی نەتەوایەتی هاتۆتە ئاراوە؛ کە لەدیدی ڕیبازە فەلسەفی یەکەی خۆیانەوە نوسیویانەو بوونی ئابووری یەکی هاوبەش دەکات بەڕەگەزێکی سەرەکیو بنەڕەتی دروستبوونی نەتەوە.لەبەر ئەوەی کوردیش ئەو رەگەزەی نی یە کەواتە نەتەوە نی یە.

ئەمە بەبڕوای من یەکەم هۆکاری ئاوڕنەدانەوەی روناکبیری کوردە بەلای مێژووی چاخە ئیسلامی یەکانی کورد، بەتایبەتی لاپەڕە پرشنگدارەکانی ئەو مێژووە، کەشەپۆلە نەتەوایەتی یەکەش کەم تا زۆر کەوتە ژێر کاریگەری تەوژمی ئەو فەلسەفەوەو، بەجۆرێ لەجۆرەکانی دەوری هەبوو لەدیاری کردنی شێوازی خەباتو ئامانجو داواکاریو ئەدەبیاتی بزاڤی هاوچەرخی نەتەوایەتی کورد.[٣]

بەڵام بۆ ئەوەی بابەتی بین دەبێ دان بەوەدا بنێین کە ئەوە تاکە هۆکار نەبووە. بەڵکو لەپاڵ ئەوەدا هەندێ هۆکاری تریش دەوریان بینیوە لەوانەش:

١) سیاسەتی دژە کوردانەی ئەو دەوڵەتانەی لەسەرەتای ئەم سەدەیەدا کوردیان بەسەردا دابەش کرا. کە ئەو سیاسەتە هەمیشە یان زۆربەی کات؛ بریتی بووە لە ڕیگرتن لە نووسینەوەو لێکۆڵینەوەو ناساندنی مێژوی کورد. ئەویش لەبەر ئەوەی هەستکردن بەناسنامەی سەربەخۆو شانازی کردنی مێژوویی لادروست نەبێتو وردە وردە بەپێی نەخشەیەکی دیاری کراو بەرەو لەدەستدانی ناسنامەو قەوارەی مێژوویی و واقیعی خۆی بچێت. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە ئەو دەوڵەتانە عیلمانی بوونو لەلایەن ناوەندە دەسەڵاتدارە جیهانی یەکانەوە پشتیوانیان لێ کراوەو لەو ڕوەشەوە دژی بوژاندنەوەی کەلەپورو مێژووی ئیسلامی بوون.

٢) پێنەگەیشتویی هەستی نەتەوایەتی لای کورد.کەئەمەش وای کردووە بەگوێرەی پێویست بایەخ بەلێکۆڵینەوەی مێژووی نەتەوەکەی نەدات .

---

[٣]) وەک ئەو کاریگەرییەی بەسەر بەرنامەی (پارتی دیموکراتی کوردستان)و دروشمەکانیدا لە پەنجاکانی ئەم سەدەیەدا هەبیو تەنانەت کۆنگرەی نۆیەمی پارتیش کەلەساڵی (١٩٧٩) بەستراوە ئاماژەی ئەو کاریگەریەی هەر پێوە دیارە.

٣) بەهۆی ئەو سیاسەتەی کە لەخاڵی یەکەمدا ئاماژەمان پێکرد ،مێژوونوسو ڕووناکبیری کورد ، ئەو دەرفەتەی لەپێشدا نەبووە، تابەقوڵیو لە ڕێی چەند داموو دەزگایەکی نیشتمانی پسپۆڕەوە لێکۆڵینەوە مێژوویی‌یەکانی بەئەنجام بگەیەنێتو لاپەڕە شاراوەکانی مێژووەکەمان وەدەرخاتەوە .

٤) کەمیی ئەو سەرچاوە مێژووییانەی باس لە مێژووی سەدەکانی ناوەڕاستی کورد دەکەن یاخود پرژوبڵاوی ئەو سەرچاوانە. بەداخەوە کورد درەنگ دەستی بەنووسینەوەی مێژووی خۆی کردووە. لەبەر ئەوە مێژوونوسی کورد دەبێت لەڕێی زانیاری پرژاوی ناو ئەو کتێبە مێژوییانەی باس لە مێژووی گەلانی دراوسێو دەوڵەتەکانو ناوچەکە بەگشتی دەکات، مێژوی خۆی بنوسێتەوە.

٥) درەنگ پێگەیشتنی هەستی ئیسلامیی کوردی بەمانای فکریو سیاسی‌یە هاوچەرخەکەی. کە ئەگەر بزاڤی ئیسلامیی کوردی بەمانا هاوچەرخەکەی زوو سەری هەڵدایەو بواری بۆ بڕەخسایەو لەدەروازە جۆراو جۆرەکانی ژیانەوە تێکەڵاو بە ژیانی سیاسیو فەرهەنگی ببوایە. دەیتوانی بەحوکمی دیدگاو فکریو ئینتیما شارستانیەتەکەی لە خوێندنەوەیەکی بابەتیانەی مێژووی کوردو نوسینەوەو ناساندنیو پەردە لادان لەسەر رووی لاپەڕە پڕشنگدارو پرسەروەریەکانو پەنجەدانان لەسەر زامو کارەساتو نسکۆکاندا، خزمەتێکی بەرچاو بە ڕێبەرایەتی خەباتی فکریو سیاسی هاوچەرخی کورد بکات.

بەڵام ئێستا دوای هەرەس هێنانی بلۆکی ڕۆژهەڵاتو ئەو گۆڕانە گەورە جیهانیانەی بەدوایدا هاتو ڕەنگدانەوەی لەسەر بزاڤی فکری‌لە کوردستاندا ،هەروەها ڕاپەڕینی بەشە کوردستانی عێراقو گەرم بوونی ڕاپەڕینی چەکداری لەکوردستانی باکوورو کردنەوەی پەنجەرەی نوێ بەڕووی کوردو کێشەکەیداو گەشەکردنی خێرای بزاڤی ئیسلامیی کوردی بەتایبەتی لەکوردستانی عێراقدا ، رووناکبیری کوردیش وەک زۆربەی ڕووناکبیرانی جیهان تارادەیەک بزوتنەوەی بەخۆدا چونەوەی دەست پێ کردووە ئەمەش بەشی خۆی کاری کردۆتە سەر خوێندنەوەی مێژوو. کەلەجاران زیاتر بابەتیانە بخوێندرێتەوەو

راقە بکرێت. گەر چی وەک وتمان هێشتا بزوتنەوەکە لەسەرەتادایە، بەڵام چاوەڕێی ئایندەیەکی ڕوناکتری لێ دەکرێت.[1] یەکێ لە نیشانەکانی ئەو بەخۆدا چونەوەش ئاماژە کردنە بەو ڕاستی‌یەی کە مێژووی نەتەوەکەمان هەمووی هەر خوێن وکەوتن‌و ژێر کەوتن‌و نسکۆنی‌یە؟ بە پێچەوانەوە لاپەڕەی‌پڕ شانازی‌و گەشی زۆریشی تیدایە، چەندان جار کورد لەمێژوودا بوونی خۆی سەلماندووەو دەوری خۆی بینیوە بەتایبەتی لە مێژووی ژیارو فەرهەنگی ئیسلامی‌دا. کەس نی‌یە بتوانێت ڕۆڵی مێژوویی کورد فەرامۆش بکات. کەدەتوانرێ لەم قۆناغە ناسکەی نەتەوەکەمانی پیادا دەڕوات بۆ گێڕانەوەی متمانەی ڕۆڵەکانی بەڕابردوو ئێستاو ئایندەیان‌و توانای گەلەکەیان لە گەیشتن بە ڕزگاری‌و ئازادی‌و سەرفرازی‌و هەڵسانەوە سوودی یەکجارزۆری لێ وەربگیرێت.بەتایبەتی زیندوکردنەوەی فەرهەنگی دەوڵەتداری لە مێژووی کورداو تیشک خستنە سەر لاپەڕەکانی، گرنگی‌یەکی زۆری هەیە بۆ ئەوەی خەباتی گەل بۆ ئایندەیەکی ڕووناک لەسەر پێگەیەکی مێژوویی پتەوەوە دەست پێ بکات. ئەمەش دەوری هەیەلەوەی هەست بەناسنامەی سەربەخۆی خۆی بکاتو خەباتەکەشی ڕۆژ بەڕۆژ بە ئاڕاستەی ڕەسەنایەتی زیاتردا بەرێت. ئەو خوێندنەوە مێژوویی‌یەی کە ئەم ئەرکەش بەجێ دێنێت پێویستە ڕەهەندی(بعد)ی کوردبوون‌و موسڵمان بوونی نەتەوەکەمان لەبەر چاو بگرێت‌وەک بەڵگەیەکی ڕاستی بۆ چونەکانی‌پێشومان‌و بەشداریەکی بچوکیش لەو بوارەدا واتە بواری خستنە ڕووی ئەو لاپەڕە مێژووییانەمان کە فەرهەنگی دەوڵەتداری کوردی پێک دەهێنن، دەمەوێت سەرنجی خوێنەرانی خۆشەویست بۆ لای دەوڵەتێکی کوردی ڕابکێشم. کە ئەویش دەوڵەتی(دۆستەکی‌یە)، کەکاتی خۆی لەسەر قەڵەمڕەوێکی بەرفراوانی کوردستاندا دامەزراوە. ئەم دەوڵەتە کەلەسەدەی چوارەمی کۆچیدا دامەزراوەو زیاترلە(١٠٠)ساڵ درێژەی بەدەسەڵاتی پڕشکۆی خۆی‌داوە کە دەشێ بەشێکی بەرچاوی خوێنەران بەتایبەتی خوێنەرانی ئاسایی لە شانازییەکانی ئەو قۆناغەو ئەو لاپەڕانەی مێژووی نەتەوەکەیان ئاگادار نەبن، کە بۆنەمرۆی کورد زۆر

---

[1]) وەک لەهەندێ نوسینی مێژوویی کوردی تازەدا هەستی پێ دەکرێتو زیاتر لە ڕوانگەیەکی نەتەوەییەوە مێژوو دەخوێنرێتەوە.

گرنگەو هەتا بلێی پەندو وانەی گرنگی تێدایە. ئەمیش لە ڕێی خوێندنەوەی لێکۆڵینەوە بە پێزەکەی مامۆستای مێژوو نووس(عبدالرقیب یوسف) کەبەناوی (الدولة الدوستکیة في کردستان الوسطی) و بەزمانی عەرەبیو لەقەوارەی دوو بەرگی(٨٧٢)لاپەڕەییدا چاپو بڵاوی کردۆتەوە.کە ڕەنگە لەبەرکەمیی بەرگی یەکەمیو بڵاونەبوونەوەی بەرگی دووەمی لەبازاڕداوکردنەوەی بەهەویر دوای لەچاپ دانی ؛ زۆر لەخوێنەران دەرفەتی خوێندنەوەیان بۆ نەڕەخسابێت. ئەمە سەرەڕای ئەوەی لێکۆڵینەوەکە بەزمانی عەرەبی نوسراوەو هەموو خوێنەرانی کوردیش عەرەبیزان نین.

بەرگی یەکەمی نووسینەکەی مامۆستابریتیە لە (٣٨٢)لاپەڕەو، تەرخانی کردووە بۆ باسی قەڵەمڕەوی دەوڵەتەکەو سەرەتای دامەزرانی و ئەو قۆناغانەی پیایدا تێپەڕیوەو سەرەنجام کۆتایی هاتنی و ڕوخانی . بەرگی دووەمیشی لە دوو توێی(٤٩٠)لاپەڕەدا تایبەتکردووە بەژیاریو شارستانی دەوڵەتەکەوە.مرۆڤ کاتێ هەردوو بەرگی لێکۆڵینەوە مێژووییەکەی مامۆستای مێژوونووس دەخوێنێتەوەو تاوتوێی دەکات، بەئاسانی ئەو قەناعەتەی لاپەیدا دەبێت کە دەوڵەتی دۆستەکی لە روانگەی پێناسەی دەوڵەت لەیاسای دەستوریو یاسای نێودەوڵەتی گشتی هاوچەرخدا تەواوی رەگەزەکانی دەوڵەتی تێدابووە. ئەگەر ڕەگەزە بنەڕەتی‌یەکانی دەوڵەت بریتی بێت لە هەرێمو گەلو دەسەڵاتی سیاسی، ئەوا دەوڵەتی دۆستەکی هەر سێکیانی تێدابووە ، کوردستانی ناوەڕاست هەرێمی دەوڵەتی پێکێ هێناوە، گەلەکەشی ئەو جەماوەرەبووە کە لەسەر ئەو هەرێمەدا ژیاوەو لە زۆرینەی کوردو هەندێ نەتەوەی تر پێکهاتووە. بنەماڵەی دۆستەکیش توانیویانە بەسەر ئەو گەلەداو لەسەر ئەو هەرێمەدا مومارەسەی دەسەڵاتی سیاسی بکەنو یاساکە-فقهی ئیسلامیی-بووە لە وڵاتەکەیاندا پیادە بکەن.تەنانەت ئەگەر باس لەڕەگەزی چوارەمی دەوڵەتیش بکەین کە دان پیانانوبەڕەسمیەتناسینی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانە، وەکێ هەندێ یاسا ناس باسیان کردووە، ئەوا دیسان ئەم ڕەگەزەشی تیابووە، چونکە سێ زلهێزەکەی دنیای ئەو کاتە، دەوڵەتەکانی عەبباسیو فاتمیو بیزەنتی دانیان پیاناوەو مامەڵەی دەوڵەتیان لەگەڵدا کردووە.

ئەگەر چاوێک بەبواری کارگێڕیو داموو دەزگا جۆراو جۆرە مەدەنیو

سەربازییەکانیشدا بگێڕین ئـەوا دیسـانەوە هەست بـەوە دەکـەین کەمەسـەلەکە لەمیرنشینێکی سادە تێپەڕیوەو داموو دەزگا بنەڕەتیەکانی ئـەو کاتـەی دەوڵـەتی هـەبووە، بـەڵکو لـەزۆر ڕووی ڕێکخسـتنی کاروبـاری دەوڵەتـەوە هیچـی وای لـە دەوڵەتە گەورەکانی ئەو سەردەمە کەمتر نەبووە کە لەسیاقی لێکۆڵینەوەکـە بـە تایبـەتی بـەرگی دووەمـی وە دەردەکـەوێت . دەوڵەتیدۆسـتەکیخاوەنی دراوی سەربەخۆی خۆی بووە کە ئەمە ڕەمزێکی دەسـەڵاتو سـەربەخۆبوونە.تاقـە شـتێ کە لەدەوڵـەتی ئێسـتانەچێ جێگیرنـەبوونی سـنوورەکانی دەوڵـەت بـووە.ئـەویش هەموو دەوڵەتانی ئەو سەردەمە وابـوونو شـەڕو شـۆڕی زۆرو ڕۆشـن نەبوونـەوەی بنەمای یاسا نێو دەوڵەتیەکان ئەو بارەی دروستکردووە.

مەسەلەی(تابع)بوونیشی بۆ دەوڵەتی عەبباسیو نووسینی ناوی خەلیفەی ئەو دەوڵەتە لەسەر دراوی دەوڵەتی دۆستەکیو پاڕانەوە بۆیو ناو هێنـانی لـە نوێـژی هەینیدا، تەنها وەک ڕێزنان بووە لەدەزگای خەلافەتو شەرعیەت بە خۆدانێکـی ئیسلامیی ئەو کاتە بووە. کەکاری نەکردۆتە سەر سەربەخۆیی دەوڵەتەکـەدیـارە دەبێ مەسـەلەکان سـەرووەرییو سـەربەخۆییو..هتـد لـە چـوار چێـوەی قۆنـاغی مێژووییەکەدا مامەڵەی لەگەڵ بکرێت.

حـەز دەکـەم لـێرەدا ئـەوە بڵێم ئـەم دەوڵەتـە لـە ڕوانگـەی تیـۆری سیاسـی ئیسلامییەوە لە ڕیزی ئەو دەوڵەتانە دادەنرێـت کـە بەفـەرمانڕەوایی ئیسـلامیی کەمو کور (الحكومة الإسلامية الناقصـــة) نـاو دەبریـن. ئەمـەش لەبـەر ئـەوەی دەسەڵاتداران لەڕێی گەلەوە هەڵنەبژێردراون یان بە زمانی ئـەو کاتـە بەیعـەتیان پێ نەدراوە.

**وەرگـێڕ**

## بەرگی یەکەم

# دەوڵەتی دۆستەکی لە کوردستانی ناوەراستدا

لەساڵی(٣٧٢)ک (٩٨٢)ز دەوڵەتی دۆستەکی کوردی لـە بەشـێکی کوردسـتانی گـەورەدا کـە بەکوردسـتانی ناوەڕاسـت نـاوی دەبـەین،کـە بەشـێ لەکوردســتانی تورکیای ئەم سەردەمەی پێکهێناوە، دامەزرا.

فەرمانڕەوایەتی دەوڵەتی دۆستەکی هەموو زەوی‌یەکانی ویلایەتی دیاربەکرو، مـاردین، سـعرد، سـیرت، بـەدلیس‌و بەشـێ لەولایـەتی موسـڵ سـەرەڕای قـەزای ئەردەشـیری سـەر بـە ویلایـەتی وان‌وهـەندێ بەشـی لەویلایـەتی(ئـالنرک، ئەلمەزیز،خەرپوت،حصن زیان) هەروەها ویلایەتی ئۆرفا (الرها)بەشـێ لەناوچـەی جەزیرە لە کوردستانی سوریا لەناوچەی(رأس العین)، تاڕووباری دیجلە، کەئێستا شارەکانی(وەریسیەو عامودەو قامیشلی‌و دیرک) دەکەوێتە سەر،گرتبۆوە.

گرنگترین شارەکانی دەوڵەتیش بریتی بوون لە دیار بەکر(ئامەد)میافـارقین، (نصیبین)و جزیرەی بۆتان (جزیرة إبن عمر)، ئەرزن، بەدلیس، خەلات(خــلاط) ئەردیش،حسنکێف.

### دامەزراندنی دەوڵەت:

لەسـەدەی چوارەمـی کۆچیـدا کوردسـتانی ناوەڕاسـت کـــە دواتــر دەوڵـــەتی دۆسـتەکی لەسـەر دامـەزرا،لـەژێر ڕکێفـی فـەرمانڕەوایی حەمدانی‌یـــەکاندابوو. مێژوونووسان باس لەوە دەکەن کە حەمدانیەکان باجێکی زۆریـان خسـتۆتە سـەر دانیشتوانی ئەو هەریمانەی کەوتۆتە ژێـر دەسـتیان‌و نـەیانتوانیوە دادپـەروەریی‌و یەکسانی لە ناو خەڵکدا پیادە بکەن.

لەبەر ئەوە شـتێکی ئاسـایی‌یە خـەڵک لەدەرفـەتێ گـەڕابن بـۆ گۆڕانـی ئـەو واقیعەی تیایدا ژیاون. ئالـەو سـەردەمەدا کـە سـنورەکانی دەوڵـەتی حـەمدانی لەگـەڵ ڕۆمـــە بیزەنتی‌یـــەکاندا ئـــارامی بەخۆیـــەوە نـــەدەبینی‌و حاڵـــەتی شەڕ،فەرمانڕەوا بوو. دەوڵەتی بیزەنتی هەرچی پێبکرایـە لـە دەسـتدرێژی کردنـە

سەر هەرێمەکانی دراوسێو لەوانەش کوردستان دەیکرد.

ئالەو ساتانەدا(**پـاد**)[1] **ی کوڕی دۆستەک**) وەک جەنگاوەرو کەسایەتی‌یەکی تا ڕاددەیەک بەدەسەلات لەمیانەی جەنگکردن لەگەڵ رۆمە بیزەنتیەکاندا دێتە ناسین.

بەبڕوای مـن(وەرگێڕ)ئەو ڕەوشە دەوری لە دروستکردنی دەوڵەتەکەدا گێڕاوەبەلایەنی کەمەوە لە سێ رووەوە:

*١- ئەم شەڕانەی (پاد)بۆتە هۆی ناوبانگ دەرکردنی،کە ئەمە بۆ هەنگاوەکانی دواتری پێویست بووە.*

*٢- سەروەتو سامانێ کە وەک دەستکەوتی جەنگ دەستی کەوتووە بۆ جموجوڵەکانی لەوە بەدوای بەکاری هێناوە.*

*٣- کۆمەڵێ جەنگاوەری ئازای لەدەور کۆبۆتەوە کەئەمیش دیسانەوە دەوری هەبووەو بونەتە(نـــواة) ی هێزە چەکدارەکانی کە لەساڵی(٣٦٨)ک (بووەیهیەکان) دەستیان بەسەر موسڵداگرتوو حەمدانیەکانیان لێوەدەرنا، هەروەها دەستیان بەسەر ئەم بەشەی کوردستانیشداگرت ساڵی(٣٧٩ک) شارەزووریشیان بەتەواەتی خستەژێر رکێفی خۆیانەوە.*

کاتێ(**عضد الدولـة**) ی سەرکردەی بووەیهی بەخۆیو بەهێزیکی گەورەوە لەساڵی (٣٦٨)ک بە نیازی داگیرکردنی موسڵو کوردستانی ناوەڕاست و باشوور ڕوی کردە ناوچەکە.کەسایەتی‌یە ناسراوەکانی دەڤەرەکە چوونە لای بۆئەوەی گوێڕایەڵی خۆیانی بۆپیشاندەن.

یەکێ لەو کەسایەتی‌یانەش(پاد)بوو بەڵام بەووتەی مامۆستای مێژوونووس لەبەرئەوەی(**عضد الدولة**) زیرەکیو لێوەشاوەییەکی ئاناسایی لە(پاد)دا بەدی کرد لیێ ترساو بڕیاری سەرو بنکردنی دا، بەڵام پاد لەو زیرەکتربوولە نیازی سەرکردەی بووەیهی حاڵی بوو، لەژێر باڵی تاریکی شەودا توانی خۆی لەچنگی دەرباز بکات.

---

[1] پاد: واتە سەرۆک. سەرودر، گەورە.

تێبینی:لەکتێبەکەی مامۆستای مێژوونووس لەبری (پاد)(باد) نووسراوە. ئێمەلەسەر داوای نووسەر خۆی وشەی(پاد)مان بەکار هێنا، چونکە بەلایەوە ئەم دەربڕینە ڕاستتر بوو.

سەرەتای پەلهاویشتەکانی(پاد) دوای ئەو ساتەو فراوانکردنی قەڵەمڕەوی دەسەڵاتەکەی زۆر ڕوون نییە. مێژوونووسان باسی چۆنیەتی دەسگرتنی(پاد)یان بەسەر شارەکانی (بەدلیس،خەلات،مەلازگر،ئەردیش) .. نەکردووە.

پێ دەچێت پێش ئەوەی هاتبێ بۆ(موصل)دەستی بەسەر ناوچەیەکی فراوانی کوردستانی سنوری دەوڵەتی بیزەنتەدا گرتبێت،دەشێ بۆ ئەم مەبەستە مردنی(سیف الدولـة) ی حەمدانی لەساڵی(٣٥٦)ک بەهەل زانیبێتو ئەو ناوچانەی خستبێتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە.

## هۆکارەکانی سەرهەڵدان و دامەزراندنی دەوڵەتی دۆستەکی:

دوای لێکۆڵینەوەی بارودۆخی ئەو کاتەی کوردستان و دەرەوەیکوردستان دەگەینە ئەوەی کۆمەڵێ هۆکار دەسنیشان بکەین کە ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەو خۆ دەوریان لە دامەزراندنی دەوڵەتەکەدا بینیوە بەم جۆرەی خوارەوە:

١) کاردانەوەی گەلی کوردستان بەرانبەر فەرمانڕەوایەتی زۆردارەواتە ئەوانەی نەیانتوانیوە لەفەرمانڕەوایی کردندا پەیڕەوی لەسەرەتاکانی دادپەروەریی بکەن.

٢) کەوتنە ژێر کاریگەریی سەربەخۆیی ژمارەیەک لەهەرێمەکانی دەوڵەتی عەبباسی.

٣) کاریگەری سەرهەڵدانی دەوڵەتەکانی بەرزیکانیو شەددادیو ڕووادی کوردی.

٤) لاوازی دەوڵەتی عەبباسی.

٥) ناکۆکیو کێبڕکێی دەوڵەتی عەبباسیو بوەیهی لەلایەک و بیزەنتی لەلایەکی ترەوە.

٦) بوونی سەرکردایەتیەکی لێوەشاوەی کوردی.

٧) تێکەڵ بوونو بەیەکدا چوونی میرنشینی بەهێزی(فنک)لە بۆتان لەگەڵ میرنشینی دۆستەکیدا.

٨) ئەو پەیماننامەی کە(پاد)دوای هەڵوێستەکەی پادشای بوەیهی بەرامبەری لەگەڵ بیزەنتەکاندا بەستی.

٩) نەبوونی هێزێکی تەواوی بوەیهیەکان لەکوردستانی ناوەڕاستدا کە بتوانێت هەوڵە فراوانخوازییەکانی (پاد) تێکبشکێنێ.

١٠) دەست نەگرتنی(عضد الدولة) بەسەر میرنشینی دۆستەکیدا لەکاتی شالاوەکەی بۆ سەرناوچەکە.

کاتێ بووەیهیەکان ڕێکەوتننامەیەکی ناگربەستیان لەگەڵ دەولەتی بیزەنتەدا مۆرکرد. داوایان لەو دەوڵەتە کرد کەناوچەکانی ژێر دەسەلاتی (پاد)یش بەبەشێ لەناوچەی ناگربەستی نێوان هەردوولا دابنرێت، بۆ ئەوەی دان بەشەرعیەتی بووەیهی بەسەر ئەو ناوچانەدا بنێ‌و وەکو قەوارەیەکی جیا مامەڵە لەگەڵ دۆستەکیەکاندا نەکات.دوای مردنی(عضد الدولة) (صمام الدولـــة) ی کوڕی شوێنی گرتەوە، سەرکردەی نوێی بووەیهی هەوڵیدا (پاد)رازی کات دان بە دەسەلاتەکەیدا بنێ‌و ملکەچی بێت و دان بەوەدا بنێت کە ولاتەکەی بەشێوەیەکی ڕەسمی بەشێکە لەدەوڵەتی بووەیهی‌و، سالانەش برێ پارە پول ڕەوانەی خەزێنەی دەولەت بکات بەرامبەر سەربەخۆییەکی ناوخۆیی کە پێی دەدرێت.

بۆ ئەم مەبەستە یەکێ لەگەورە سەرکردەکانی خۆی ناردە لای(پاد) بەلام (پاد)مەرجەکانی ڕەتکردەوەو پێیان رازی نەبوو.

لەسیاقی روداوەکاندا وادەردەکەوێت کە(پاد) داوای سەربەخۆیی تەواوی کردووە.

دوای نائومێد بوونی(صمام الدولة) لەوەی پاد ملی بۆ کەچ کات. سوپایەکی لەبەغداد بەسەرکردایەتی(ابي سعد بهرام بن اردشـير)بۆ جەنگی پاد تەیيارو ئامادەکرد.

سەرەنجام شالاوی کردو لەئەنجامی ئەو شالاوەشدا جەنگی(نصيبـــف) هەڵگیرساو سوپای بووەیهی تووشی تێکشکانێکی خراپ هات.

(صمام الدولة) دوای ئەم هەوڵە ناکامەش کۆڵی نەداو بەسەرکردایەتی یەکێ لە دڵسۆزترین سەرکردەکانی کەناوی(سـعد الحـاجب)بوو، سوپایەکی نوێی سازکرد.. کاتێ ئەم هێزە تازەش بەرەو ناوچەکە کەوتنە ڕێ لەگوندی(باجلێ)ی نزیک زاخۆ بەیەکگەیشتن‌و شەڕ دەستی پێکرد.

ئەم شەڕەش بەسەرکەوتنی هێزە کوردیەکە کۆتایی پێ هات.

## دەوڵەتی دۆستەکی پەیماننامەی ئاشتی دەبەستێت:

کاتێ سەعد بەتێکشکاوی گەڕایەوە ناو موسڵو سوپای دۆستەکی بەدوایدا هاتو دەستی بەسەر(موصل)دا گرت. خەڵکی لەڕووی هێزەتێکشکاوەکەی هەڵگەڕانەوەو پێشوازییەکی گەرمیان لە(پاد)و سوپاکەی کرد. لەو ساڵەدا کە (پاد)دەستی بەسەر شاری(موصل)دا گرت واتە ساڵی(٣٧٣)ک دەنگو باسێکی گەرم لەبەغدای پایتەختی بووەیهیەکان لەئارادا بوو کە(پاد)هێرش دەکاتە سەر پایتەخت و بەنیازە دەوڵەتی بووەیهی بڕوخێنێت.

شەڕی(باجلێ)گرنگ بوو، سام و هەیبەتی (پاد)ی زیاتر کرد ناوچەی بادینانو موسڵو دەوروبەری کەوتە ژێر دەستی قەڵەمڕەوی دەوڵەتەکەی فراوان بوو.

دوای تێکشکانی هێزەکەی (سعد)، (صمام الدولة) فەرمانی پێ کردلە (تکریت)بمێنێتەوە بووەیهیەکان هێزێکی گەورەیان پێکەوەناو لەساڵی(٣٧٤)ک شالاویان بردە سەر هێزەکانی پادو ئەمجارەیان توانیان هێزەکانی تێک بشکێنن.

کاتێ(پاد) لەموسڵ شکا، بەرەو هەرێمی دیاربەکر پاشەکشەی کرد بەو مەبەستەی هێزەکانی ڕێکبخاتەوەو بەر لەشالاوی بووەیهی بگرێت.

کاتێ هێزە شالاو بەرەکانی بووەیهی لە دوو لاوە پەلاماری دەوڵەتی دۆستەکیان دا بەو مەبەستەی بەتەواوی تیای بەرن؛ زۆربەی هەرە زۆری سەربازەکان لەفەرمانی سەرکردەکانیان هەڵگەڕانەوەو ئامادە نەبوون شەڕ بکەن.

(صمام الدولة) کاتێ بۆی دەرکەوت بەتەنها لەتوانایدا نییە دەوڵەتی دۆستەکی لەناو بەرێت،ویستی لەڕێی هاوپەیمانیەتی حەمدانییەکانی شامەوە ئەم کارە بکات و تەماعی ئایە بەریان کە هەرێمی دیار بەکریان بداتێ.دوای زنجیرە شەڕێ ئەم شێوازە نوێیەش سەرکەوتوو نەبوو،لەبەر ئەوە بووەیهییەکان کاتێ لەوە نائومێد بوون لە ڕێی کاری سەربازیەوەبتوانن دەوڵەتی دۆستەکی بڕوخێنن؛ نەخشەی تیرۆرکردنی(پاد)یان داڕشت؛ بەڵام لەم نەخشەیەشدا کوشتنی پادو روخانی دەوڵەت سەری نەگرت.

لەساڵی(٣٧٥ک)دا هەر دوودەوڵەتی بووەیهیو دۆستەکی پەیماننامەیەکی ئاشتییان مۆرکرد. هەردوولا تاساڵی(٣٧٧ک- ٩٨٧ز)بە پەیماننامەکەوە پابەند بوون و ناوچەکە ماوەیەک بەئارامی بەسەری برد. دوای ئەوە شەڕ دەستی پێ کردەوە.

## پاد دەکوژرێو سەرکردەی سوپا (ابو علی حسن) کاروباری دەوڵەت دەگرێتە دەست

دوای لاواز بوونی دەسەڵاتی بووەیهی لەموسڵ هەردوو میری دوورخراوەی حەمدانی(اباعبدالله وابا طاهر) بەهەلیان زانیو دەستیان بەسەر موسڵ داگرت.(پاد)ئەم بارەی بەدەرفەت زانیو خۆیو سوپاکەی ڕوبانکردە موسڵ بەمەبەستی کۆنترۆڵ کردنی، میرە حەمدانی یەکان کەبۆیان دەرکەوت ناتوانن بەتەنها ڕووبەرووی سوپاکەی(پاد)ببنەوە داوای یارمەتییان لە دەوڵەتی(عقیلی)کرد شەڕ دەستی پێکردو پشتیان لەهێزەکانی پاد گرت.پاد کە بەمەی زانی ویستی بکشێتەوە بۆ چیاکانی دەوروبەرو خۆیو سوپاکەی ڕزگار کات؛ بەڵام لەکاتی کشانەوەدا(پاد)کوژرا.

بەناشیرینی لەگەڵ تەرمەکەیدا جولانەوە.خەڵکی موسڵ بەم ڕەفتارە دزێوە زۆر بێزارو تووڕەبوون و هاواریان کرد: ئەمە جەنگاوەرێکی ئیسلامی(غازی)یەو چۆن دەشێ شتی ناوای دەرهەق بکرێ؟ لەبەر ئەوە کفنیان کردوو نوێژیان لەسەر کردو بەخاکیان سپارد، پاشان جەماوەری موسڵ پرسەیان بۆ داناو زۆری بۆ گریان. چونکە (پاد)یان زۆر خۆشدەویست، جێگای وەبیر هێنانەوەیە عەرەبەکانی موسڵ ویستیان سالی (٣٧٩ک) شارەکەیان لەدەستی حەمدانی یەکان دەربهێننو بیدەن بەدەست پادەوە گەر چی وەک خۆشیان عەرەب بوون. هەر بۆیە جەماوەری شارەکە خۆپیشاندانێکی گەورەیان دژی دەسەڵاتدارانی حەمدانی سازدا دژی کوشتنو شێواندنی تەرمەکەی.

دوای شەهید بوونی(پاد)(ابو علی حسن)ی خوشکە زای یەکێ بوو لەسەرکردە سوپاییەکانی، سوپاکەی لەموسڵ پاشە کشە پێکردو جێگای خاڵی جڵەوی بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەتی گرتە دەست وساڵی(٣٨٠)بوو بە پادشای کوردستانی ناوەڕاست.

کوژرانی(پاد) سەرەڕای حەمدانی یەکان دەرفەتی بۆ ئەرمەنو بیزەنتیەکانیش سازاند. دوای مردنی پاد لەهەموو لایەکەوە مەترسی ڕووی لەدەوڵەتی دۆستەکی کرد.

## دەوڵەتی دۆستەکیو سیاسەتی ئاشتیخوازی:

لەساڵی(٣٨٠ك) ئەرمەنیەکان شاڵاویان بردە سەر شاری(مەلازگر)و ئابلۆقەیان بەسەردا سەپاند.

خەڵکەکەش دوای تەواو بونی ئەو کەرەسەو تفاقەی هەیانبوو ناچار خۆیان بەدەستەوەدا.

دوای ئەوە ئەرمەنیەکان دانیشتووە موسڵمانەکەی شارەکەیان دەرکردوو ماڵەکانیان تالان کردن و مزگەوتی گەورەی شارەکەیان ڕووخاند، کارە چەپەڵەکانی میر(داود)ی سەرکردەی ئەرمەنەکان رقی میرە موسڵمانەکانی دەورو بەری هەڵساندو داوایان لێ کرد لەشارەکە بکشێتەوەو بیسپێرێتەوە بەدەستی موسڵمانان بەڵام ڕازی نەبوو.

(مەملان)کە میری حکومەتی(روادی)کوردی بوو سوپایەکی گەورەی بۆ ڕزگار کردنی مەلازگر کۆکردەوە.لەسەرەتاوە شاڵاوی بردە سەر سنورەکانی ئەرمینیاو سوپایەکی ئەرمەنی تێکشکاند بەڵام سەرەنجام نەیتوانی شارەکە ڕزگار بکات و لەژێر چنگی ئەرمەنیە داگیرکەرەکان دەری بێنێت.

ڕۆمە بیزەنتیەکانیش کەلەکاتی(پاد)دا پەیمانی ئاشتیان لەگەڵ دەوڵەتی دۆستەکیدا هەبوو مردنی(پاد)یان بەدەرفەت زانی بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەو پەیمانەو چاویان لەکەنارەکانی باکووری دەریاچەی وان بڕیبوو.

لەساڵی(٣٨٢ك-٩٩٢ز) -قەرالی- بیزەنتە(بسیلیوسف)سوپایەکی گەورەی بۆ داگیرکردنی شارەکانی(مەلازگر، خەلات، ئەلجواز(ذات الجوز)، ئەردیش) ڕەوانەکردو ئابلۆقەی دان.

بەڵام دانیشتوانی ئەم شارانە خۆڕاگریەکی پاڵەوانانەیان نیشاندا تا(ابوعلی)بەخۆیو هێزە شەڕکەرەکانیەوە گەیشتو سوپای شاڵاو هێنەرو داگیرکەری بەزاندو زیانێکی گەورەی لێدا.(ابو علی) بۆ ڕووخاندنی وڕەی سوپای بیزەنتینیو ترساندنی پێی وتن:هەر بەیانی سەربازانی ئیسلام لەهەموو لایەکەوە دەگەنە لام. بەم جۆرە بەشێکی گرنگی وڵاتی دۆستەکیبەورەیەکی بەرزو پۆڵاینەوە لەمەترسیو هەڕەشەی داگیرکەرانی بیزەنتینی رزگاری بوو.

دوای ئەوەی سوپای بیزەنتینی نەیتوانی لەشاڵاوەکەیدا سەرکەوتن بەدەست بهێنێت و سوپای دۆستەکی بەسەریدا سەرکەوت هەردولا پێ خۆشبوونی خۆیان

بۆ پەیڕەوکردنی سیاسەتێکی ئاشتیخوازانەو پتەوکردنی پەیوەندی دۆستانەی نێوانیان وەک جاران نیشانداو پەیمانێکی ئاشتیان بۆ ماوەی(١٠)ساڵ مۆرکرد.

سەرکەوتنی(ابو علی)و دەستڕاگەیشتنی بەئاگر بەست(هدنة) لەهەردوو ڕوی سیاسیو سەربازییەوە سەرکەوتنێکی گەورە بوو بۆ دەوڵەتی دۆستەکی.

دەرگای شەڕی بەڕووی دەوڵەتێکی مەسیحی گەورەو دڕندەدا داخست کە سەدان ساڵ بوو هێرشی دەهێنایە سەر کوردستانی ناوەڕاستو کاولیو وێرانییەکی زۆری تیا بەجێ هێشتبوو.(ابو علی)لەگەڵ سەرجەم دەوڵەتو میرنشینەکانی دەوروبەردا پەیوەندییەکی دۆستانەی دامەزراند.

سەرەڕای ئەرمەنو ڕۆمەکان، پەیوەندییەکی توندو تۆڵی لەگەڵ دەوڵەتیفاتمیو عەبباسیو بنەماڵەی دەسەڵاتداری حەمدانی لە(حەلەب) دا دامەزراند، لەسایەی ئەم سیاسەتە ئاشتیخوازانەدا کەفەرمانڕەوایانی دوایئەویش درێژەیان پێدا. ژیانێکی ئاشتیو هێمنانەو پڕ لەئارامی بۆ گەلی دۆستەکی فەراهەم کرا .

دوای ئەمەلەهەوڵێکی ناپاکانەداو لەشاری دیاربەکرو(ئامەد)،(ابو علی)کوژرا، و(ممهد الدولة) شوێنی گرتەوەو چووە سەرتەختی فەرمانڕەوایی دەوڵەتی دۆستەکی.

## دەوڵەتان نوێنەر لەگەڵ( ممهد الدولة )دا دەگۆڕنەوە:

سێ دەوڵەتە گەورەکەی ئەو کاتەی جیهان وەفدیان ناردە لای(ممهد الدولة)ی پادشای دۆستەکیوەفدێکی ڕەسمی دەوڵەتی عەبباسی بەمەبەستی پیرۆزبایی دەست بەکاربوونی هاتنە لایو دان پیانانی خەلیفەی عەبباسی(القادربالله)و سوڵتانی بووەیهی (بهاء الدولة)یان بەحکومەتەکەی ڕاگەیاند.

هەروەها خەلیفەی فاتمیش(الحاکم ابن العزیز)نامەیەکی بەوەفدێکی ڕەسمیدا بۆ ڕەوانە کردو، تیایدا دانی بەحکومەتەکەی(ممهد الدولة)دا نابوو دیاری دانسقەشی لەگەڵ وەفدەکەدا ناردبوو.

دەوڵەتی بیزەنتیش دانی بەحکومەتەکەی دانا بەڵگەشمان لەسە رئەمە ئەوەیە کەبەندەکانی ئاگر بڕی ساڵی(٣٨٢)ک، لەسەر دەمی ئەم پادشا تازەدا جێبەجێکردو شتێکی واش ڕووی نەدا پەیوەندییەکانی هەردوولا تاڵۆزو تێک بدات.

ساڵی(٤٠١ك)(شیروه)بەپیلانێکی تر ئەم فەرمانڕەوایەشی کوشت. دەستی بەسەر پایتەخدا گرتو روخانی دەوڵەتی دۆستەکی ڕاگەیاند.لەم کاتەدا خواجە(ابو القاسم)والی(ارزن)هەواڵی کوشتنی میری بیستو (نصر الدولة)ی مەروانی لەکوشتن ڕزگار کرد.دواتر جەماوەری لەدەوری سەرکردایەتی(ابا ناصر)کۆکردەوەو هێزەکانی‌شیروەیان لەدەوروبەری پایتەختدا تێکشکاندو دەروازەی(میافارقین)یان بەسەر خۆیان داخست.

(شیروه)نامەیەکی بۆ ئیمپراتۆری بیزەنتی ناردو ئەوەی خستبووە پێش چاوی کە ئامادەیە پایتەختی بدا بەدەستەوە.خەڵکی شاربەمەیان زانی‌و لەم نیازەی(شیروه)زۆر بێزاربوون.خەڵکی لەدوای نوێژی هەینی ڕاپەڕین‌و شاڵاویان بردە سەر چەکدارەکانی (شیروه)و زیانێکی زۆریان پێگەیاندن و دەستیان بەسەرکۆشکی پادشایەتیدا گرت.دواتر هێزەکانی(نصر الدولة)ی دۆستەکی سەرکەوتووانە هاتنە ناو شارەوەو دەوڵەتی لە روخان ڕزگار کردو دەستی کرد بە ڕێکخستنەوەی کاروبارەکانی‌و لە(شیروه)ش خۆش بوو.

دوای ئەوەی میر لە ڕێکخستنەوەی داموو دەزگاکانی دەوڵەت بۆوە کاروباری گێڕایەوە حاڵەتی ئاسایی خۆی؛ بڕیاری هاتە سەردروستکردنی‌کۆشکێکی گەورەو رازاوەی وەها شان لەشانی کۆشکی پادشاکانی ئەو سەردەمە بدات.هەروەها هەرسێ دەوڵەتە گەورەکە! عەبباسی‌و فاتمی‌و بیزەنتی دانیان بەحکومەتەکەی(نصر الدولة)دا ناو پەیوەندی دۆستانەیان لەگەڵدا دامەزراند.

لەکۆتایی ساڵی (٤٠٣ك-١٠١٣ز)دا هەر دەوڵەتەو لەلای خۆیەوە نوێنەری خۆی بەدەستەو دیاری دانسقەو گرانبەهاوە ڕەوانەی پایتەختی دەوڵەتی دۆستەکی کرد. بۆئەوەی پادشای دۆستەکی لەدانپیانانی دەوڵەتەکەی بە حکومەتەکەی ئاگادار بکاتەوە.

ئەوەی جێگای سەرنجە نوێنەری هەر سێ دەوڵەتەکە لەیەك ڕۆژدا گەیشتونەتە پایتەختی دەوڵەت.ئەوەی زیاتر دڵی(نصر الدولة)شی خۆش کرد ئەوە بوو ئەم سەردانانە هاوکات بوو لەگەڵ تەواو بوونی کۆشکی پادشایەتی‌و ئاهەنگەکانی جەژنی قوربان‌دا.

ڕۆژی چوارەمی جەژن(نصر الدولة) بۆ بەسەربردنی ڕۆژێکی خۆشی ژیانی لەسەرکورسی پادشایەتی دانیشتبوونوێنەری عەبباسی لەلای ڕاستیەوەو هەردوو

نوێنەری فاتمیو بیزەنتیش لەلای چەپیەوە دانیشتبوون.

هەریەکێ لە نوێنەری عەبباسیو فاتمی نازناوی تایبەتی خەلیفەکانیان پێ بوو بۆ ئەوەی پادشای دۆستەکی بەسەر خۆیدا ببرێت. دیارە ئەو کاتە ئەو دوو دەوڵەتە لەسەر سەرکردایەتی کردنی جیهانی ئیسلامیی کێبەرکێیان بوو، بۆیە هەریەکەیان دەیویست سۆزی دەوڵەتی دۆستەکی بەلای خۆیدا رابکێشێت.

سەرەنجام پادشای دۆستەکی نازناوەکەی خەلیفەی عەبباسی هەڵبژارد کە(نصر الدولة)بوو نەکێ هی نوێنەری فاتمی کە(عز الدولة)بوو، ئەمەش ئەوە نیشان دەدات کە پادشای دۆستەکی ڕێزی عەبباسییەکانی بەسەر فاتمیەکاندا داوە، هەروەکێ شوێنی دانیشتنی نوێنەری عەبباسیش کەلەلای ڕاستی خۆیەوە بوو ئاماژە بوو بەمە..

ئەم ڕێزدانەش وەکێ نووسەر بۆی چووە لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە بووە:

١- لایەنی مەزهەبی: چونکە دەوڵەتی دۆستەکی(سوننی بووە)و دەوڵەتی عەبباسیش سەرکردایەتی ئەو مەزهەبەیان دەکرد بەڵام فاتمیەکان شیعە بوون.

٢- ئەو ڕێزە مەعنەویەی خەلافەتی عەبباسی لە کوردستاندا هەیبوو، کە گەلی کورد ڕێزی زۆری ئەم خەلافەتەیان دەگرت.

٣- لایەنی ئابووری: ئەم لایەنەش بایەخی خۆی هەبووە چونکە دەوڵەتی دۆستەکی بەرهەمە نیشتمانییەکانی بۆ ساغ کردنەوە دەناردە عێراق، کەل و پەلە پیشەسازییەکانی شاری دیار بەکر لەبازارەکانی بەغدای پایتەختدا دەفرۆشرا.

ڕووباری دیجلەش ڕێگایەکی بازرگانی گرنگێ بووە کە کوردستانی ناوەڕاستی بە عێراقەوە بەستۆتەوە.

٤- ئەشێ نزیکیو پەیوەندیڕاستەوخۆی هەرێمەکوردییەکان بەخەلافەتی عەبباسییەوە یاخود لەژێر(نفوذ)و کاریگەری ئەودا کاریگەری خۆی هەبوو بێت.

بەڵام ئەوە ناگەیەنێ دەوڵەتی دۆستەکی دوژمنی دەوڵەتیفاتمی بوو بێت، بەڵکو دۆستایەتی نێوانیان تاساڵی(٤٣٠ک)درێژەی کێشا بەڵام دوای ئەوە ئەم پەیوەندییانە ئاڵۆزبوون ئەویش لەبەر ئەوەی نوێنەری فاتمی لەحەلەب ویستی وڵاتی دۆستەکی داگیر بکات، چونکە هەرچەندە لەڕووی شەرعیەتەوە دەوڵەتی دۆستەکی سەر بەخەلافەتی عەبباسی بووە، بەڵام لەواقیعدا(بێ لایەنی)

دیارترین سیمای هێڵە گشتی‌یەکانی سیاسەتی دەرەوەی دەوڵەت بووە.

## دەوڵەتی بیزەنتی هەولی داگیرکردنی رەها دەدات:

لەبەر زۆر هۆی ئاینی‌و ستراتیژی‌و مێژوویی دەوڵەتی بیزەنتی ویستی دەسەلاتی خۆی بەسەر شاری(رەها)دا بسەپێنێ، پادشای دۆستەکیش بەتوندیی دژی ئەم نیازەی بیزەنتی‌یەکان وەستا، چونکە بەهەرەشەی بۆ سەر ولاتەکەی لەقەڵەم دەدا،(رەها)ئەگەر چی بەشێ نەبوو لە دەوڵەتی دۆستەکی بەلام لە ژێر (حمایە)ی ئەودا بوو، بیزەنتیەکانیش بەهۆی سەرکردەیەکی ناپاکی(عقیلی)یەوە توانیان دەست بەسەر شارەکەدا بگرن.

کاتێ (نصر الدولة) بەمەی زانی دەستو برد کەوتە سازدانی هێزەکانی بەمەبەستی بەربەستکردنی شالاوی هاوبەشی بیزەنتی‌و عقیلی بۆ سەر ناوچەکانی تری ولات. (نصر الدولة) سەرەڕای هێزەکانی خۆی هێزێکی گەورەی موسڵمانە خۆبەخشەکانی هەرێمەکانی دەوروبەرکە بەگیانی بەرگری کردن لە ولاتی موسڵمانان هاتبوونە مەیدان، لەدەور کۆبۆوە.

دەوڵەتی بیزەنتی کاتێ هەستی بەوە کرد لەمەیدانەکەدا بەتەنها نی‌یە، وەئەگەر شەڕ هەڵ بگیرسێت میرنشین‌و دەوڵەتە ئیسلامی‌یەکانی ناوچەکە پشتی دەگرن‌و جەنگەکە بوعدێکی ئیسلامیی فراوان وەردەگرێت و ئەمەش درێژە دەکێشێ‌و وێرانکاری زۆری بەدواوە دەبێت؛ لەبەر ئەوە هەر چۆنێ بوو ویستی پادشای دۆستەکی‌قایل بکات شەڕەکە نەکات،لەم کارەشیدا سەرکەوت،گەرچی ساڵی داهاتوو(نصر الدولة) جارێکی تر شالاوی بردەوە سەر شارەکە بۆ ڕزگار کردنی،بەلام سەرکەوتوو نەبوو.

## دەوڵەتی دۆستەکی دەکەوێتە بەر شالاوی هێزەکانی سەلجوقی:

بەمردنی (ابی کالیجار)ی پادشای بووەیهی لەساڵی(٤٤٠ک-١٠٤٩ز)و دانانی کوڕەکەی.(مەلیک ڕەحیم)لە شوێنەکەی. دەوڵەتی بووەیهی بەتەواوەتی بەرەو لاوازی‌و پوکانەوە چوو.. تا سەرەنجام(طغرلبك)ی سەلجوقی لەساڵی(٤٤٧ک- ١٠٥٥ز)دا دەوڵەتی ناوبراوی لەناو بردو رەحیم پاشای گرتو بەندی کرد.(طغرلبك) ویستی لەپێش عێراقدا دەست بەسەر کوردستاندا بگرێت، ئەویش لەبەر ئەو هەڵکەوتە ستراتیژیەی هەیبوو پێی ناسرابوو، ئەگەر چی ئەو ، دەست بەسەرا گرتنە هەر بەناویش بێت هەر گرنگ بووە، چونکە لەهەردوو دەوڵەتی بیزەنتی‌و فاتمی نزیک بوو.

ساڵی(٤٤١ک-١٠٥٠ز)نوێنەری نارده لای(نصر الدولة)ی دۆستەکیو داوای لێ کرد بێتە ژێر ڕکێفیەوەو گوێ ڕایەڵیو ملکەچیی خۆی بۆ نیشاندا.

دروشمی ئەم گۆێ ڕایەڵیەش ئەوە بێت کە خوتبەی هەینی بەناوی ئەوەوە بخوێنرێتەوە(نصر الدولة) ناچار بوو وەلامی داواکاریەکەی بداتەوەو بە گوێی کات، چونکە ئەوەی بەباشتر زانی لەوەی دەوڵەتەکەی تیا بچێت.(نصر الدولة) بەزیرەکیو لێهاتوویی خۆی توانی لەگەڵ سەلجوقیەکاندا هەڵبکاتو پارێزگاری لەدەوڵەتەکەیو هێمنی ولاتەکەی بکات.

(نصر الدولة)ناوبەناو دەستو دیاری گرانبەهاو پارەو پولێکی باشی دەنارده دەرباری سوڵتانی سەلجوقی بۆ ئەوەی ولاتەکەی لەداگیر کردنی سەلجوقی بپارێزێت. ئەم سیاسەتە ژیرانەی(نصر الدولة) بووە جێگای ڕێزی(طغرلبك)تەنانەت بۆ بەردانی پادشای ئەنجاز کە-لای ئەو بەند بوو، وەئیمپراتۆری بیزەنتی بەجۆرەها شێوە هەوڵی بەردانی دابوو- بەلام نەیتوانیو داوای لە(نصر الدولة)کرد کەلەلای سوڵتانی سەلجوقی داوای بەربوونی بۆ بکاتەئەویش (شیخ الاسلام ابا عبدالله بن مروان)ی نارده لایو بەریدا بەمەش ئەوەندەی تر پلەو پایەی (نصر الدولة)لای ئیمپراتۆری بیزەنتە گەورەتر بوو.

لەڕاستیشدا ئەم(نصر الدولة)یە بەیەکێ لەگەورەترینو بەدەسەلاتدارترین پادشایانی دۆستەکی دەژمێردرێت،کاری چاکو ناوبانگی باشەی زۆر بووە مۆزۆر ڕێزی لەپەنابەران گرتووە لەسەر دەمی ئەودا چەندان وەزیرو میرو بازرگانو جوتیار بۆرزگاربوون لە باری سەختی ژیان ڕوویان لە سایەی دەسەلاتەکەیئەو کردووە، (نصر الدولة)ش ڕێزی زۆری لێ گرتوون وبەو جۆرەی شایانی ئەوانە ژیانو گوزەرانی بۆ دابین کردوون،کە ئەمەش شانازیەکی مێژوویییە بۆگەلی کورد.

## (نصر الدولة) سەرکردەی هەڵکەوتوو:

(نصر الدولة)زۆر سوربووە لەسەر نوێژە فەرزەکان لەکاتی خۆیدا کردوونیو دەگێڕنەوە کە لەهەموو ژیانیدا نوێژێکی بەیانی نەچووە، کە هەموو سێ ڕۆژ جارێک لەگەڵ لێپرساوە گەورەکانی سوپادا کۆبۆتەوە بیەکێ لەسیاسەتەکانی(نصر الدولة) ئەوە بووە پارەی داوە بۆ دوورکەوتنەوە لەشەڕو هەوڵی بەئاشتی چارەسەرکردنی کێشەکانی داوە.

پیاوێکی دڵنەرمو بەسۆزو حەزی لەئاوەدانکردنەوەو شارستانیەت کردووە هەر جارێ کە هێزێکی شاڵاو هێنەر دەیویست هێرش بکاتە سەر وڵاتەکەی، گەورە بەرپرسانی دەوڵەتی کۆدەکردەوەو لێی دەپرسین ئەو شەڕە چەندی تێدەچێ؟ ئەوانیش خەرجی شەڕەکەیان لەکاتی هەڵگیرساندا دەخەملاند، ئەویش دەیووت دەبڕۆن ئەو پارەو پولەی تێی دەچێ بۆیانبەرنو وڵاتەکەمان لەشەڕو کاولکاریی بپارێزن.تەنانەت زۆر جار لەبەر ئەم سیاسەتە ژیرانەی بەوە تاوانبار کراوە کە عەوداڵی دوای خۆشیو سەلامەتیی خۆیەتیو نایەوێ رووبەرووی دوژمنەکانی ببێتەوە.

لەلایەکی ترەوە پیاوێکی دادپەروەربووە هەرکەسێ ژیاننامەی ئەم پادشایە بخوێنێتەوە بۆی رۆشن دەبێتەوە کە زۆر کەم لەپادشایانی سەردەمی خۆی لەم بوارەدا پێی گەیشتوونەوە، وەهیچ گەلێکی تری ناوچەکەی بەئەندازەی کورد لەسایەی دەوڵەتی خۆیدا بەئازادیو دڵنیایی و هێمنیو لەژێر سایەی دادپەروەریی فەرمانڕەواکانیدا نەژیاوە بەتایبەتی سەردەمی(نصر الدولة)کە گەلێ لەمێژوونوسان ستایشی سۆزو دادپەروەریی ئەویان کردووە.ئەوەتە لەم بارەوە(إبن كثير)لە(البداية والنهاية)کەیدا دەڵێت:(وڵاتەکەی -یانی وڵاتی دۆستەکی- نارامترینو خۆشترین وڵات بووە بەلەهەموووڵاتانی تر زیاتر دادپەروەریی تیا چەسپیوە).

(إبن أثير)یش ستایشی سیاسەتەکانی(نصر الدولة)دەکاتو باس لەوەدەکات کە چۆن وڵاتەکەی پڕ بووە لەزاناو سەنگەرەکانی لای ئەو قایم بوونو هەڵسو کەوتو رەفتاری لەگەڵ گەلەکەیدا بەرزوجوان بووە. دادپەروەریی ئەو فەرمانڕەوا کوردەو باشی سیاسەتەکانیو ژیاننامەی سەرنجی خەڵکی وڵاتانی تریشی بۆ لای خۆی ڕاکیشاوە.

مێژوونوسی گەورە(فارقی)لە مێژووەکەیداو لە زۆر جێگادا ئاماژە بەدادپەروەریی (نصر الدولة)و پێشکەوتوویی سەردەمەکەی دەکات. ئاماژە بەوە دەکات کەلەسەردەمی ئەودا هیچ کەسێ زوڵمی لێ نەکراوەو دەست بەسەر ماڵو موڵکیدا نەگیراوە هەروەها دەڵێت: بەوە ناسراوە کە هەرگیز درهەمێکی لەکەس نەسەندووە.

زۆر دڵ نەرمو خۆش مەشرەب بووە.تەنانەت سۆزی ئەو، پەلەوەرەکانیشی لێ

بێبەش نەبووە، کاتێ سەیری کرد پەلەوەرەکان لەزستاندا برسییان دەبێتو لە گوندەکاندا دانیان بۆ ڕۆدەکەنو راویان دەکەن؛ فەرمانیدا (سایلۆی گەنم)بۆ ئەو پەلەوەرانە بکرێتەوە بۆ ئەوەی بە ئەندازەی پێداویستی زستانەیان دانەوێڵەی تیا هەڵبگیرێن، هەتا ئەو ڕۆژەی کۆچی دوایی کرد پەلەوەرەکان زستان میوانی(**نصر الدولة**)ە فەرمانڕەوای دڵ نەرم و دادپەروەری دۆستەکی بوون.

## دەوڵەتی دۆستەکی بەدەستی سەلجوقییەکان کۆتایی پێ دێت :

لەمانگی(ربیع الأول)ی ساڵی(٤٩٨ک-١٠٦٦ز)دا هەزارسوار کە لەلایەن دەوڵەتی سەلجوقییەوە نێردرابوون گەیشتنە هەرێمی دیار بەکرو ئابڵوقەی(میافارقین)ی پایتەختیان دا، دەوڵەتی دۆستەکی بەپێدانی (٣٠٠٠٠٠)سێسەد هەزار دینار لەگەڵیانا ڕێکەوت تادەست لەئابڵوقەکە هەڵبگرن، دوایمردنی(**نظام الدین**)ی فەرمانڕەوای دۆستەکی(منصور)ی کوڕی ناوی پادشای لێنراو فەرمانڕەوایی گرتە دەست کە بە(**ناصر الدولـــة**) ناسراوەو دوایەمین فەرمانڕەوای وڵاتی دۆستەکی بووە.

ساڵی(١٠٨٤ز) جارێکی تر سەلجوقییەکان بۆ دەستگرتن بەسەر کوردستاندا جموجوڵیان دەست پێ کردەوە لەو ساڵەدا (ملک شـاه)بڕیاریدا دەوڵەتی دۆستەکی لەناو بەرێت.

بۆ ئەم مەبەستە سوپایەکی سازکردوو ڕەوانەی کوردستانی ناوەڕاستی کرد، لەساڵی(٤٧٦ک-١٠٨٤ز)دا هێزەکانی گەیشتنە جێو شەڕ لەنێوان سوپای سەلجوقیو هێزە دۆستەکیەکاندادەستی پێکرد.

کاتێ سوڵتان هەستی کرد ئەو هێزە توانای لەناوبردنی دەوڵەتەکەیان نییەسوپای دۆستەکی بەرگرییەکی زۆر دەکات ساڵی(٤٤٧ک-١٠٨٥ز)هێزێکی تری ناردە فریای ئەو هێزە، لەو سەرووبەرەدا(**نـاصر الدولـــة**) لەگەڵ دەوڵەتی(**عقیلـــي**)دا ڕێککەوتبوو لەسەر بەرەنگاربوونەوەی سەلجوقییەکانو لەبەرامبەریەوە بەڵێنی هەندێ شتی پێدا، کاتێ سەرکردەی سوپای سەلجوقی بەو هاوپەیمانییە عەرەبی- کوردییەی زانیویستی لەگەڵ هەریەک لەگەڵ ئەو دوودەوڵەتە ئاشتەوایی بکات بەڵام هەوڵەکانی سەری نەگرت، لەهێرشێکدا هێزە عەرەبیەکە تێکشکا کاتێ سەرکردەی سوپای سەلجوقی هەواڵی تێکشکانی

هێزە عقیلیەکانی لەدەوروبەری دیار بەکردا پێ گەیشت، بڕیاریدا خۆی ڕووبکاتە دەڤەرەکەو یەکەمجاردەوڵەتی(عقیلـــی)تیابـەریت ودوای ئـەویش دەوڵـەتی دۆستەکی بڕوخێنێت.

لەســەرەتاوە شــاری(موســڵ)ی داگــیرکرد ســـاڵی( ٤٤٧ک-١٠٨٥ز) (ملکشاه)خۆی سەرکردایەتی هێزێکی کـردوو ڕووی کـردە ولاتـی جزیـرەو کوردستانی ناوەڕاست بەڵام هەڵگەڕانەوەی براکەی لیێ لە خۆراسان ناچاری کرد واز لە هێرشەکە بێنێو پەیمانی ئاشتیشی لەگەڵ دەوڵەتی(العقیلیـــة) مۆرکرد، بەڵام ئەمە هەنگاوێکی تاکتیکی بوو هەربۆیە ساڵی(٤٧٩ک-١٠٨٧ز)گەڕایەوە دەستی بەسەر دەوڵەتی(العقیلة) داگرتوسوپاکەی دەوڵەتی دۆستەکیشی داگیر کرد ســەرجەم شـارە گرنگـەکانی دەوڵـەت وەک(بـەدلیس - ئـەرزن - خـەلات - ماردین - جزیـرە - موسـتکیف)و زۆر شـارو قـەلای تـری کـوردی کەوتنـە ژێـر ئابلۆقەی سەلجوقیەوە، گرنگـترین شـار کـە دەسـتی بەسـەرا گـیرا شـاری دیـار بــەکربوو کــە بــەقایمترین شــاری کوردســتانی ناوەڕاســت دەژمــێردراو لەساڵی(٤٧٨ک- ١٠٨٦ز)دەستی بەسەرا گیرا.

دوای ئابلۆقەیەکی زۆر(فارقین)یش گیرا دوای ئەویش(جزیرە)کەتائـەو کاتـە خۆی نەدابوو بەدەستەوەدەستی بەسەرا گیرا.

هەندێ سەرچاوەی مێژوویی ئاماژە بەوە دەکەن (ناصر الدولـــة منصـــور) فــەرمانڕەوایی ولاتــی دۆســتەکی لــە کــاتی ئــەم شـــالاوی داگیرکردنـــەدا لە(اصفهان)بوو لـەلای مـەلیک شاە بۆ ئـەوەی لەگـەڵیا ڕێبکـەوێت و نـەهێڵێ ولاتەکـەی داگـیر بکرێـت بـەم جـۆرە دوای بەرگرییـــەکی پاڵەوانانـــە کـــە هـــەر لەساڵی(٤٧٦ک)ەوە تاکۆتایی ساڵی(٤٧٨ک) درێژەی کێشا؛ دەوڵەتی دۆستەکی بەدەستی سەلجوقی‌یەکان کۆتایی پێ هات.

## مەلیك مەنصور دەوڵەتی دۆستەکی زیندوو دەکاتەوە:

(ناصر الدولـــة) لـەگوندی(حربـی)نزیـک بـەغدا نیشـتەجێ بـوو چـاوەڕێی هەلێکی دەکرد بۆ ئەوەی ولاتەکەی بگێڕێتەوە ژێر دەسەلاتی خۆیو دەوڵەتەکەی زیندوو بکاتەوە. بەمردنی سـوڵتان (مـەلیک شـاە) لـە سـاڵی (١٠٩٣ز)ئـەم دەرفەتەی دەست کەوت، ڕوی کردەوە کوردستانو یەکـەم جـار شـاری (جزیـرە)ی

گێڕایەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی.جزیرەی کرد بەبنکەیەک بۆ پەیوەندی کردن بەگەڵو بەشەکانی تری وڵاتەکەی لەماوەی دوو مانگداو بێ جەنگو کوشتار دەستی بەسە رناوچەکانی جزیرەو میافارقینو دیاربەکردا گرت.دوای مردنی(مەلیک شاه)بارودۆخێکی نوێ لە ناوچەکەدا هاتە کایەوەو بوو بەهۆی سەرهەڵدانەوەو دروست بوونەوەی هەندێ لەو میرنشینو دەوڵەتانەی کاتی خۆی سەلجوقی یەکان لەناویان بردوون، لەوانەش دەوڵەتی دۆستەکی بەڵام ئەمە زۆری نەخایاندو سەرکردەی سەلجوقی(تشن)ڕێگای لەم ڕەوتە گرت،(ناصر الدولة) لەگەڵ حاکمی موسڵو میری (بنی العقیل)دا لەسەر ئەوە ڕێککەوتن بەهاوبەشی بەرەنگاری هێرشەکانی (تشن) بووەستنەوەو بەرگری لە وڵاتەکانیان بکەن..بەڵام ئەوسوپا هاوبەشە لەبەردەم شاڵاوی هێزەکانی(تشن)دا خۆی ڕانەگرت و تێکشکا.

دوای ئەوی(تشن بن الب ارسلان)شاری(نصیبین)ی داگیرکردوو دەستی بەسەر موصڵدا گرت بەو جۆرەی کە بڕیار بوو ڕووی لەبەغدا نەکردەوە، بەڵکو بەخۆیو هێزە گەورەکەیەوە ڕووی‌کردە دەوڵەتی دۆستەکیو گەیشتە هەرێمی دیاربەکر یەکەم جار شاری دیاربەکریداگیر کرد، دوای ئەوە (فارقین)ی پایتەختو شارو ناوچەکانی تر، یەک لەدوای یەک کەوتنە ژێر دەستی.. بەم جۆرە دەوڵەتی دۆستەکی کوردی کە(١٠٦)ساڵی ڕەبەق درێژەی کێشاو لەگەورەترین ئەو دەوڵەتو نیمچە دەوڵەتانەی چاخە ئیسلامی یەکان بووەو لە زۆربەشیان لەڕووی هێزو شارستانیو ڕێکخستندا پێشکەوتووتر بوو، ناوی لەبووندا سڕایەوە وکۆتایی پێ هات.

## هۆیەکانی روخانی دەوڵەت

کۆمەڵێک هۆکار دەوریان لەڕووخاندنی ئەو دەوڵەتەدا هەبووە؛ کەئەمانەی خوارەوەن:

١) **کاڵو کرچی سیاسی(ناصر الدولە) و لاوازی توانا سیاسی‌یەکانی بۆ حوکم کردنی دەوڵەتو بەڕێوەبردنی کاروبارەکان**،یەکێ لەو هەڵانەی ئەوە بوو کەڕازی نەبوو لەگەڵ

سوڵتانی سەلجوقیدا ولآتەکەی بەش کات،چونکە ئەوکاتە بەتەواوی ولآتەکەی لەدەست نەدەچوو، هەروەها لەهەڵەکانی تریشی دوژمنایەتی کردنی(تشن)و لێک تێنەگەیشتن بوو لەگەڵی دا.

٢) **لێنەهاتوویی(ابی سالم الطیب)ی وەزیری، بەرامبەر ئەو ئەرکە گەورەی کەوتبووە سەرشانی**، هەروەها کەمی ئەزمونی سیاسی ئەمەش بەتایبەتی لەو نامەیەدا دەردەکەوێ کە بۆپادشای دۆستەکی ناردووە بۆ(اصفهان)لەو کاتەی لەگەڵ سوڵتانی سەلجوقی دا لەو وتووێژەدا بوو.لەنامەکەدا داوای لەپادشا کردبوو کەهەڵوێستی ڕەق بێتر بەلەدەست دانی بەشێ لەخاکەکەی ڕازی نەبێ، هەروەها لەدیاری کردنی هەڵوێستی سەربازیشدا کەوتبووە هەڵەیەکی گەورەوە کەبەپادشای وتبوو دەتوانین یەک ساڵ بەرگری بکەین لەکاتێکدا ولآت لە هەموو لایەکەوە نابلۆقەیەکی خنکێنەری خرابووە سەر.

٣) **خراپی باری کارگێڕی**،چونکە باری کارگێڕی وەک لەوەو پێش نەمابوو ئەمەش وای کردبوو کە هاولآتیان هەست بەوە بکەن کاروباریان باش ناڕوات بەڕێوەو دادپەروەریش جوان ناچەسپێ‌و پیادە ناکرێت.

٤) **ڕژدی‌و چاوچنۆکی بێ سنووری پادشا**: (ناصر الدولـــة) دوا پادشای دۆستەکی‌یەکان بوو پیاوێکی بەخیل‌و چاوچنۆک بوو،ڕژدی(ناصر الدولـــة) یەکێ بوو لەهۆکانی ڕوخانی دەوڵەتی دۆستەکی، ئەم ڕژدی‌یە نەیهێشت وەڵامی داواکاری‌یەکەی سوڵتانی سەلجوقی(مەلیک شاه)بداتەوە کەداوای لێ کردبوو تەسبیحەکەی باپیری نصر الدولةو شمشێرەکەی (موصلْ) ی میری بۆتانی بەدیاری بۆ بنێرێت، نوێنەرەکەی سوڵتانی بەدەستی خاڵی ڕەوانەکردەوە کەئەمە خۆی لەخۆیدا سوکایەتی پێ کردنی بوو تەنانەت دیاری‌یەکی دینار بەهایشی پێ نەدا ئەمەش ڕق‌و توڕەیی سوڵتانی هەڵسان،ئەم سوکایەتی کردنەی(نــاصر الدولــة) بەسوڵتانی سەلجوقی لەلایەن(ابن جهیرة)وە قۆزرایەوەو هۆیەک بوو لە هۆیەکانی کۆتایی هاتنی دەوڵەتەکە.

٥) **یەکسانی لەنێوان موسڵمانەکان‌و دیانەکاندا**،ئەمەش ئەمە ڕقی هەندێ

موسڵمانی دەمارگیری بەرچاو تەنگی هەڵساندبێو ڕۆڵی هەبووبێ لە ڕووخاندنی دەوڵەتەکەدا. (مامۆستای نووسەر) بەڵگەیەکی وای نەهێناوەتەوە تادڵی خوێنەر لەم بارەوە ئاو بخواتەوە (وەرگێڕ).

٦) **لەرووی هێزی سەربازیو توانای جۆراو جۆرەوە سەلجوقییەکان باڵادەست بوون بەسەر هێزەکانی دۆستەکیدا.**

٧) **مل کەچ نەکردن بۆ دەوڵەتی سەلجوقی:** نوسەر دەڵێ زۆر لەم هۆیە دڵنیانیم، بەڵام ئەگەر ئەوە راست بێ کە (محمد زەکی) باسی دەکات کە (منصور) خوتبەی بەناوی خەلیفەی (فاتمی) یەوە خوێندۆتەوە ئەمەش عەبباسییەکانو سەلجوقییەکانی بێ تاقەت کردبێ، ئەوا لەم هۆیە کاریگەر بووە.

ئەوەی سەرنج راکێشە لەم باسەدا ئەو هۆیەی که هەمیشە لەڕووخانی دەوڵەتو میرنشینە کوردییەکاندا باس کراوەو باس دەکرێت ئەویش کە ناکۆکی ناوخۆی کوردانە لێرەدا دەوری نییە، چونکە لەماوەی (١٠٦) ساڵی حوکمی دۆستەکییەکاندا تەنها یەک ناکۆکی لەناو بنەماڵەی دەسەڵاتداراندا رووی‌داوە کەلەنێوان می (نظام الدین و سعید) ی برایدا بوو، ئەویش سەرەنجام بەگریانو باوەش بەیەکدا کردنو پەشیمان بوونەوە کۆتایی پێ هات.

ئەم حاڵەتە خاڵێکی هەرە بەهێزی دەوڵەتی دۆستەکی بووە.

## هۆیەکانی مانەوەی دەوڵەت

ئەگەر سەرهەڵدانو رووخانی دەوڵەتەکە هۆی تایبەتی خۆی هەبوو بێت ئەوا مانەوەشی بۆ ماوەی یەک سەدە زیاتر هۆی تایبەتی خۆی هەبووە، کە گرنگترینیان ئەمانەن:

١) سەقامگیری سیاسەتی ناوخۆ.

٢) سەقامگیری باری ئابووری وڵات.

٣) رژێمی فەرمانڕەوایی مۆرکی خێڵایەتی پێوە دیار نەبوو.

٤) دامەزراویی لەسیاسەتی دەرەکیدا.

٥) سیاسەتی ئاشتیو بێ لایەنی کەدەوڵەت لەسەری دەڕۆیشت.

٦) دادپەروەریی لەفەرمانڕەواییدا دڵسۆزی گەل بەرامبەری.

٧) یەکێتی دۆستەکییەکانو دڵسۆزییان بۆ دەوڵەت، کەوڵات لەناکۆکی ناوخۆییو شەڕی لاوەکی پاراست.

**بەرگی دووەم**

# ژیاریو شارستانێتی دەوڵەتی دۆستەکی

دەوڵەتی دۆستەکی خاوەنی شارستانێتی تایبەت بەخۆی بووە کە بەشێکیش بووە لەشارستانێتی ئیسلامیی ئەو کاتەی ناوچەکە. لەم بەشەدا کە پوختەی ناوەرۆکی بەرگی دووەمی کتێبەکەی مامۆستای مێژوونووسە. خوێنەر شارەزاییەکی گشتی لەو ژیاریو شارستانیەتە پەیدا دەکات.

وەک ئاماژەمان پێکرد بەرگی دووەمی کتێبەکە لە چوارچێوەی (٤٩٠) لاپەڕەدا بۆ ژیاری دەوڵەتی دۆستەکی تەرخان کراوەو ئەم بابەتانەی خوارەوەی لە خۆگرتووە.

**یەکەم**: پەیوەندیە دەرەکیەکانی دەوڵەتی دۆستەکی.

**دووەم** : رژێمی سیاسیو کارگێڕی.

**سێهەم** : رژێمی دارایی.

**چوارەم** : هێزە چەکدارەکان.

**پێنجەم** : ژیانی مرۆیی.

**شەشەم**: ژیانی کۆمەڵایەتیو ئایینی.

**حەوتەم**: ژیانی ئابووری.

**هەشتەم**: ژیانی رۆشنبیری.

**نۆیەم**: هونەری بیناسازیو نەخشو نیگار.

**دەیەم**: شوێنەوارە ئاوەدانیەکان.

جا لێرە بواری ئەوە نیە بەدرێژی ئاماژە بەم باسو خواسانە بکرێت.

بابەتی یەکەم کەم تا زۆری لە بەرگی یەکەمدا ئاماژەی پێکراوە.. لەبەرئەوە بە پێویستمان نەزانی لێرە دووبارەی بکەینەوەو، یەکسەر دەچینە سەر بابەتەکانی تر.

# رژێمی سیاسیو کارگێڕی

دەوڵـەتی دۆسـتـەکی وەکێ هـەر دەوڵـەتێکی پێشکەوتووی سـەردەمی خـۆی کەوتۆتـە ژێـر کاریگـــەری ڕژێمـــە سیاســـیو کارگێرییـــە هاوچەرخـــەکانی دەوروبەری بەتایبەتی دەوڵەتە ئیسلامی‌یەکان. لـەپێش هـەمـوانەوەش دەوڵـەتـی عەبباسیو فاتمی،بەڵام کتو مت لەبەرگیراوی ئەو دەوڵەتانـەش نـەبووە،هـەندێ دابـو نەریتیو یاسای سیاسیو کارگێڕی هەڵقولاوی ژینگە کوردستانی‌یەکە بووە.

لێرەدا پێویستە بەکورتی ئاماژە بەشتێ بکرێت ئەویش ئەوەیە کـە دەوڵـەتی دۆستەکی‌وابەستەی دەوڵەتی عەبباسی بووە،دروشمی ئەم وابەستەیەش ناوهێنانی خەلیفە بووە لەوتاری نوێژی هەینی‌داو دوعا بۆ کردنیو نووسینی ناوەکـەی بـووە لەسەر دراوی وڵات،بەڵام ئەمە تەنها وابەستە بوونێکی ئەدەبیو ڕەمـزی ڕۆتینـی بووە، چونکە دەوڵەت لە ڕووی کارگێڕیو سیاسی‌یەوە سەربەخۆیانە کاروبارەکانی هەڵسوڕاندووە،(گـەر چـی ئـەو وابەستە بوونـە ڕەمزیـیـە بەرامبـەر دوژمنـە دەرەکی‌یـەکانی لـە زۆر کـاتدا سـودی هـەبووە.) زۆر لـەو نازناوانـەی میرەکـانی دۆستەکی پێ‌ناوبراوە لەلایەن خەلیفە عەبباسی‌یەکانەوە پێیان دراوە وەکێ ڕەمزێ بۆ داننانی خەلیفە بەشەرعیەتی دەوڵەتەکەدا.

## میرایەتی( الامارة ):

میری دۆستەکی کەسی یەکەمی دەوڵەت بووە و دەسەڵاتی تـەواوی هـەبووەو زۆربەی کاروبارەکانی لەژێر دەسەڵاتی ئەودا بووە.

دەسەڵاتی هەڵگیرســاندنی شـەڕو بەسـتنی پـەیمانی ئاشـتیو دیـاری کردنـی جێنشـینو نـاردنی نوێنـەر بـۆ وڵاتـانو دیـاری کردنـی سیاســەتی دەوڵــەت بــە شێوەیەکی گشتی کاری ئەو بووە.

ڕاگـەیاندنی دانـانی مـیری دۆســـتەکی لەســـەر تـــەختی فـــەرمانڕەوایی لـــە کۆبوونەوەیەکی‌گەورەو فراواندا بـەڕێوەچووە،تیـایدا وەزیـر سـەرکردەکانی سـوپا، میرەکـان، کەسـایەتی‌یەکانی گـــەورەکانی پایتـــەخت، ڕۆڵـــەکانی بنەماڵـــەی دۆستەکی، دادوەر، شایەتەکانیو شاعیرەکان بەشدارییان تێدا کردووە، هــەروەها سرودی تێدا وتراوەو بەمیرو دەزگـای فـەرمانڕەوایی هـەڵوتراوە،جا بـەپێی ڕای پەسەندی مێژوونوس میری دۆستەکی سوێندی یاسایی خواردووە کە دڵسۆز بێ

بۆگەلو ولات و لەپێناو خێروخۆشی گەلەکەیدا تێبکۆشێ.

**جێنشینی:**

رژێمیفەرمانڕەوایی سەردەمی((پاد))ی دامەزرێنەری دەولەتیو هەردوو سەردەمی(ابي علي) و(ممهد الدولة) پشتاو پشت نەبوو هەرچەندە ئەم سێ میرە هەموویان لەباروددۆخی ناناسایی‌داو بەکوشتن تیاچوون‌بەلام لە سەردەمی میری چوارەمەوەئەحمەدی کوڕی مەروان(نصر الدولة) بەڕەسمی ڕژێمی فەرمانڕەوایی بوو بە پشتاو پشت.. میر یەکێ لەنەوەکانی‌خۆی‌دیاری دەکرد بۆ ئەوەی‌دوای مردنی شوێنی بگرێتەوە.

**وەزارەت:**

پایەی وەزارەت لەدەولەتی دۆستەکیدا لەساڵی دووەمی دوای دامەزراندنیەوە هاتە کایەوە،کاتێ((پاد))لەساڵی(۳۷۳ک-۹۸۳ز)شاری (موصل)ی گرت(أباالمطرق)ی کرد بە وەزیری خۆی.کە پێشتر کارگێڕی دەولەتی بووەیهی بوو بەسەر موصلەوە.

دوای ئەوە بۆماوەیکی دوورودرێژ پایەی وەزیر لە دەولەتی دۆستەکیدا نەما تالەدوایی‌دا ماوەیەک بەر لەڕوخانی دەولەت هاتەوە کایە. دیارە وەزیر کەسی دووەمی دەولەت بووەو لەدوای میر بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی دەولەتی لە ئەستۆدا بووە.

**سکرتێر:**

سکرتێر یان(حاجب)کاری بریتی بووە لە پەیوەندی ڕێکخستنی نێوان پادشاو خەڵک.کاتی چاوپێکەوتنەکانی دیاری کردووە.کاری لەم جۆرەی کردووەو هەندێ جاریش دەسەلاتی فراوانی هەبووەوئەم فەرمانە لەدەولەتی دۆستەکیداهەبووەو، یەکەم سکرتێریش ناوی(عبدالله)بووە.کەبە(عروس الخيل)ناسراوەو سوارچاکێکی کوردی بووە.

گەر سەیری دەسەلاتی سکرتێر بکەین لەدەولەتی دۆستەکیدا- سەیری دەکەین زۆر فراوانەو لە دەسەلاتی‌وەزیر نزیک دەبێتەوە بەجۆرێ بەشداری‌یەکی کاریگەری بەڕێوەبردنی دەولەتی کردووە.ئەوەی جێی سەرنجە لەهەندێ برگەی مێژویی ژیانی دەولەتدا ئەم فەرمانە نەهێلراوە.

## دیوانی نوسین و نامه:

یەکێ لەفەرمانگەکانی دەوڵەت فەرمانگەی نوسین و نامە بووە ئەوەی لێپرسراویەتی ئەم فەرمانگەدەوڵەتی‌یەی گرتبێتە ئەستۆ، پێویست بووە نوسەرێکی لێهاتوو ئەدیبێکی هەڵکەوتوو وزمان پاراو بوو بێت.لە پادشاوە زۆر نزیک بووە.ئەرکەکانی ئەم فەرمانگەیە هەروەک مێژوو نووسان باسی دەکەن بریتی بووەلە نووسینی نامە ڕەسمی‌یەکانی پادشا کە بۆ میرەکان وگەورە پیاوانی دەوڵەت و پادشایان ڕەوانەی کردووە.هەروەها نووسینی پەیماننامەی نێوان دەوڵەتو دەوڵەتانی تر.نامەی دەرەوەشی وەرگرتووە.دەتوانیین بڵێین ڕۆڵی نیمچە وەزیرێکی دەرەوەی ئەم کاتەی بینیوەو وەک وەزیرێکی دەوڵەت سەیری کراوە.ئەم فەرمانگە گرنگە لەدەوڵەتی دۆستەکیدا هەبووە.

## چاودێر(الحسبة أو العقبات):

ئەرکی ئەم فەرمانگەیە جۆراوجۆر بووە.فەرمان کردن بەچاکەو نەهی کردن لەخراپەو چاودێری کردنی بازاڕو بەرگری کردن لەفڕوفێڵو تەرازوو بازیو ناپاکی لەمامەڵەو کڕینو فرۆشتندا. سەیری خواردنو خواردنەوەو پێداویستیەکانی تری ڕۆژانەی خەڵک کراوە تا بزانرێ سیفەتی کالایەکی بەسودیان تێدایە؟.

هەروەها لەنیشەکانی تری بریتی بووە لە پاراستنی ئەو بازرگانە غەریبانەی نەشارەزابوون بەباری بازاڕ بۆ ئەوەی نەخەڵەتێنرێن، کارێکی تری پاک ڕاگرتنی شەقامو کۆلانو چاودێری خانوو بەرەو ڕێگرتن بووە لەوەی کە کۆڵ کێش کۆڵی قورس هەڵگرێت، یاخود باری قورس لە ولاخی بارەبەر بنرێت.یاخود مامۆستا لەقوتابیەکانی بدا..هتد، ئەم فەرمانگە بایەخدارە لە ڕیزی دامودەزگاکانی دەوڵەتدا هەبووە.

## ئەوقاف:

فەرمانگەیەکی گرنگی دەوڵەتی دۆستەکی بووە.دامەزراوێکی ئابووری پڕ بایەخ بووەو خاوەنی وزەو توانایەکی دارایی فراوان بووەو زەویو زارو خانووبەرەیەکی زۆری لەناوچە جۆراو جۆرەکانی کوردستانی ناوەڕاستدا هەبووە. (نصر الدولة) هانی(وەقف)ی دەدا.وەگرنگی بەفراوانکردنیو باشکردنی بەڕێوەبردنی دەدا..

خۆی چەندان زەویو زارو خانوو بەرەی کردە وەقفی هەژارانو پردو دامەزراوە

سەربازییەکانو نەخۆشــخانەی(فـارقین)..(وەقـف) لـە دەوڵـەتی دۆسـتەکیدا زۆر بــواری ژیــانی گرتبــووە هــەژاران و دامــەزراوە ســەربازییو زانســــتییەکانو مزگەوتەکان و نەخۆشخانەکانی گرتبووەوە.کـارێکی کردبـوو کـەداموو دەزگایـەکی زۆری دەوڵەت بەبەروبوومی موڵکە وەقف کراوەکان بەڕێوەدەچوون.

**بەڕێوەبردنی شورەکان:**

لەبەر ئەوەی (شورە)بۆ شارە کوردەکان زۆر گرنگ بووە.

دەوڵـەتی دۆستەکی فەرمانگەیـەکی تایبـەتی بـەم شـورانەوە بـە تایبــەتی شـورەی(میـا فـارقین)ی پایتـەخت دانـاوە بـۆ ئـەوەی ڕووخاوییــەکانیان چــاک بکرێنەوە وەک دەزگایەکی بەرگریو سەربازی گرنگ پارێزگاریان لێ بکرێت. زۆر جاریش موڵکایەتی جۆراو جۆر وەقفی پاراستنی ئەم شورانە کراون.

**دادوەری (القضاء):**

دادوەریی بریتیــیــە لـەحوکم کـردن بـەگوێرەی شـەریعەتی ئیسـلامیی،دادوەر بەسروشتی حاڵ کەسێ بووە کە شارەزاییەکی قوڵی لەفقهی ئیسـلامیدا هـەبووە لەگەڵ ئەو مەرجانەی کەیاسا ناسە ئیسلامییەکان بۆ دادوەریان داناوە.

ئەوەی جـێی سـەرنج بێـت لـەم بـارەوەو پەیوەسـت بـێ بـەیادی دادوەری لـە دەوڵەتی دۆستەکیدا ئەم خاڵانەی خوارەوەیە:

(ا) هـەر نوسـتان(ولایــة)ێـک یـاخود شـارێکی گـەورە دادوەری بـۆ دامەزرێنراوە.

(ب) دوای دامــەزراندنی دادوەر بەفـەرمانێکی ڕەسمـی لەلایـەن دەوڵەتـەوە دوانـدەر(خطیــب) لـە نوێــژی هــەینیدا فەرمانەکــەی بەســەر نوێژکــەراندا خوێندۆتەوەو ئاگاداری کردوون.

(ج) واپێ دەچێت پێش قۆناغی دەوڵەتی دۆستەکیو تـانیوەی یەکـەمی ئـەم دەوڵەتەش مەزهەبێ لەچوار مەزهەبە ناسراوەکە لەناو کوردستان بلاو نەبوبێتەوە وقازی بەزانیاری خۆی یان بەو مەزهەبەی کە خۆی بـاوەڕی پێـی بـووە حوکمـی کردووە.

تالەسەدەی پێنجەمی کۆچیـداو لەسـە ردەسـتی مـەلا عـەبدوڵلای کـازەرۆنی مەزهــەبی پێشــەوا شــافعی(ڕەحمــەتی لێ بێــت)لــەرێی قوتابخانــە

شەرعی‌یەکەی(فارقین) ی پایتەختەوە بەناو گەلی‌کوردا بڵاوبۆەو ئیتر دادوەریش بەو مەزهەبە حوکمی دەکرد.

(د) لەدەوڵەتی دۆستەکی‌دا وەک لێکۆڵینەوە مێژوویی‌یەکان دەری دەخەن بە پێچەوانەی دەوڵەتە دراوسێکانی وەکو دەوڵەتی عەبباسی پایەی دادوەرەکان (قاضي القضاة) نەبووە.

## دادپەوەریی:

فەرمانێکە پەیوەستە بەدادوەریەوە ئەوانەی بەم کارەهەڵساون بە(دادپەوەر) ناوبراون.

ئەرکەکەشیان‌دوای مۆڵەت دانی دادوەر بریتی بووە لەشایەتی‌دان لە نێوان خەڵکیدا تۆماری تایبەتیان هەبووە.کەمولکو ماڵوقەرزو مامەڵەی خەلکیان بە گۆیرەی شەریعەتی ئیسلام تیا تۆمار کردووە.

شوێنی دانیشتنی تایبەتیان هەبووەو یەکێ مامەڵەو عەقدی هەبووبێ سەردانی کردوون.لەمەرجەکانی دادپەروەر ئەوە بوو خاوەنی ئەمانەتو دادپەروەریی بێ‌هەروەها ئاگای لەئەحکامەکانی شەریعەتی ئیسلام هەبێتو توانای ڕێکخستنی تۆماریشی هەبێ.

دادپەروەر یارمەتی دادوەردەدا لەکاتی بینینی سکاڵانامەو داوانامەی خەڵکیداو، زانیاری پێویستی پێدەدات‌ئەنانەت دەربارەی ڕەوشتو ڕەفتاریشی زانیارییان داوە بەدادوەر‌دادوەریش لەلای خۆیەوە چاودێری ئەمانی کردووەوە بۆ ئەوەی بزانێ ئاخۆ مەرجی ئەمانەتو دادپەروەرییان تێدایە یاخود نەء.کارێکی تری دادپەروەر بریتی بووە لە چاودێری کردنی ئەو بڕیارەی دادوەر دەری دەکات بۆ ئەوەی بزانێ پێچەوانەی ئەحکامەکانی شەریعەتی ئیسلام نی‌یە. ئەم فەرمانە لەدەوڵەتی دۆستەکیدا وەکو زوربەی دەوڵەتە ئیسلامی‌یەکانی ئەو سەردەمە هەبووەو نیشانەی گەشەسەندنی باری ژیاریو ئاوەدانو پێشکەوتنی وڵاتیش بووە، چونکە ئاماژە بەگەورەبوونی شارەکان و ئاڵۆزبوونی دەزگاکانیو پێویستی ئەو دەزگایانە بەدەزگای تر بۆ ئەوەی بتوانێ کارەکانی ئاسان بکات‌دەکات.

فەرمانێکی تریش هەبووە کەبە(شـوطي)یـاخود نووسـەر نـاوبراوە و سـەربە دەزگای دادوەری بووە.

ئـەرکی بریتـی بـووە لـە لەڕێکخسـتنی دانیشـتنەکانو تۆمـارکردنی حوکـمو نووسینی، هەندێ جاریش کەدادوەر لەئارادا نەبووە جێگای ئەوی گرتۆتەوە.

## رژێـمی دارایـیو دراوی بـەردەست

لەدەوڵەتی دۆستەکیدا مامەڵە کـردن بـە درهـەم ودینـار بـووەو ئـاڵوگۆڕیش لەمامەڵە بچوکە ناوخۆییەکانداو بەتایبەتی لەناو خەڵکی گوندنشیندا بـاو بـووە. ئەگـەر ئـەو دراوانـەی لـەو سـەردەمەداباو بوبێـت لـەناو بازاڕەکـانی دەوڵـەتی دۆستەکیدا مامەڵەیان پێ کرابێ ئـەوا خۆشـی وەک دەوڵـەتێ دراوی سـەربەخۆی خۆی لێداوە.

دراوەکەشی بریتی بووە لـە درهـەمی زیویـن کـە بـەکێشو قـەبارەو بـەرواری جۆراو جـۆر لێـدراوە بـۆ ئـەوەی ببێتـە دراوی ڕەسمـی دەوڵـەت.لـە کوردسـتانی ناوەڕاسـتی ئـەو کاتـەدا چـەندینێ هـەبووە کـە دراوی تیـا لێـدراوە.لەوانـەش میافارقین ، دیاربەکر،جزیرە ، **خلاط**،..هتد.

چەند نموونەیەکی ئەم دراوانـە لەمۆزەخانـەی بـەریتانی لەلـەندەنو موزەئـی هەمایۆن لەئەستەمبوڵ پارێزراون.ئەو دراوەی کە نووسەر لە مۆزەخانەی بەریتانی دەستی کەوتووە بریتیـیە لە(٣)درهەم:

**یەکەمیان** لەساڵی(٣٨٥ک-٩٩٥ز)و لەشـاری جزیـرە لێـدراوە نـاوی(ابـی علی)کوڕی مەروانی میری بەسەرەوەیە.

**دراوی دووەم** لەشـاری(نصیبـین)و لەسـاڵی(٣٩٧ک-١٠٠٧ز)لێـدراوەو ناوی(**الدولة ابي منصور**) واتە سەعیدی کوڕی مەروانی بەسەرەوەیە.

**دراوی سێهەم** ساڵی(٤١٢ک- ١٠٢١ز) لێدراوە ناوی(**نصر الدولـــة ابي نصر**)ی میری بەسەرەوەیە.

ڕووی درهەمەکان نووسینی بەسەرەوەیە..

لێرەدا نموونەی سەر ڕووی درهەمێ دەخەینە بەردەستی خوێنەران.

**درهەمی ژمارە(١) کە لە جزیرەو لەساڵی٣٨٥ك لێدراوە**

| ڕوو (چەق) | پشت(چەق) |
|---|---|
| ألله | لاإله إلا الله |
| محمد رسول الله | وحده لاشريك له |
| صلى الله عليه وآله | الملك بهاء الدولة |
| القادر بالله | أبو نصر |
| الأمير ابو علي | حرب |
| الحسن بن مرون | |

**پەراوێز: ئەم دراوە لە جزیرە لەساڵی ٣٨٥ك لێدراوە**(ولو كره المشركون).

دیارە نوسراوی سەر ڕووی دراوەکە ئاماژە بۆدان پیانانە ئەدەبی‌یەکەی دەوڵەتە بۆ خەلافەتی عەبباسی‌و ناوی پادشای بووەیهیشی لەسەرە بەو سیفەتەی فەرمانڕەوای دەوڵەتی عەبباسی بووە، لێدانی دراوی سەربەخۆی دەوڵەتی دۆستەکی ڕەمزی سەربەخۆیی و دەسەڵاتی کوردی بووە.

## فەرمانگەی کۆکردنەوەی دارایی( ديوان الجباية ):

بریتی بووە لەو فەرمانگەی هەڵساوە بە کۆکردنەوەی داهاتەکانی دەوڵەتو وەرگرتنی ئەودارایی‌یە ساڵانەی بڕیاربووە دەوڵەت وەری بگرێت هەر هەمان فەرمانگە هەڵساوە بەخەرج کردنی بۆ ئەرزاقو موچەی فەرمانبەرانو هێزە چەکدارەکان و خزمەت گوزاریە کۆمەڵایەتی‌یەکانو ڕووی جۆراو جۆری تر ئەم فەرمانگە تۆماری ناوی‌سەربازو پۆلیس‌و فەرمانبەران و بڕی موچەی هەریەکەیان لابووە.

فەرمانگەی کۆکردنەوەی داهات لە دەوڵەتی دۆستەکیدا هەروەکو دەوڵەتانی تر لقو فەرمانگەی خۆی لە ویلایەتەکانی دەوڵەتدا هەبووە کەسەر بە ئەم بوون. ساڵی(٤١٥ك-١٠٢٤ز) بەرپرسیاریتی فەرمانگەی کۆکردنەوەی داهاتی دیاربەکر لەئەستۆی پیاوێکی مەسیحی‌دا بووە بەناوی(ابن القماز) ئەوەی شایەنی باسە بەفەرمانبەرانی ئەم فەرمانگەیە وتراوە(عمال) هەرچی پەیوەندی

بەسەرچاوەکانی داهاتی دەوڵەتیشەوە هەیە زۆر ڕوون نییە.

## هێزە چەکدارەکان

(ا) **سوپا**: دەوڵەتی دۆستەکی سوپایەکی نیزامی هەبووە، سەربازەکانی خواردنو موچەیان لە دەوڵەتەوە وەرگرتووە..لەکاتی جەنگو باری نائاساییدا هێزە خۆبەخشەکانی گەل کۆمەکیان کردووە.

❁ سوپا سەرکردایەتی باڵای هەبووە و لە پایتەخت جێگیر بووە، ئەم سەرکردایەتییە لەگەورە فەرماندەکانو فەرماندەی گشتی هێزە چەکدارەکان پێکهاتووە.کە(فارقی)مێژوونووس بە(**صاحب العسکر**)ناوی دەبات. ئەم ناوە لەزۆر دەوڵەتی ئیسلامیی ئەو سەردەمەدا بەسەر فەرماندەی گشتی هێزە چەکدارەکاندا براوە.

❁ فەرمانێکی تری پەیوەست بەسوپا بریتی بووەلە(**عارض الجیش**) پیشاندەری سوپا. کارەکەی ئەوە بووە هەر ناوەناوە سوپا بەبەردەمیا(**استعراض**)ی کردووە بۆ ئەوەی دوای ئەوەی بەبەردەمیدا تێدەپەڕنو سەیری جلو بەرگو چەکو وڵاخی هەریەکەیان(گەر سوارە بوو) دەکات.

ئەرزاقو موچە بەسەر سەربازو فەرماندەکان بدات: ئەم(استعراض)ە بەهەمان شێوە لەدەوڵەتی عەبباسیدا هەبووە.

❁ سوپا فەرمانگەیەکی سەربازی تایبەتی هەبووە بە (**دیوان الجند**) ناوبراوە کە هەڵساوە بەتۆمار کردنی ناوی سەربازو جۆریان لەپیادەو سوارە.هەروەها جۆری چەکی هەریەکەیانو شتی لەم جۆرە سەرەڕای هەڵسان بەئەرکی دابین کردنی پێداویستییەکانی سوپاو چەکدارکردن. لەڕۆژگاری ئەمڕۆدا وەزارەتی بەرگری بە ئەم ئەرکانە هەڵدەستێ.

❁ ڕێکخستنەکانی سوپا بەم جۆرە بووە:

(١) پیادە (٢) سوارە (٣)تیرهاوێژەکان

مێژوونوس باس لەوە دەکات کە سوپا بەسەر چەند یەکەی دابەش بووبوو کە پێکهاتبو لە(١٠)سەرباز، ١٠٠، ١٠٠٠، ١٠٠٠٠. پلەی ئەفسەریەتیش واتە ئەفسەرەکانی سوپا بەم جۆرە بووە:(**عەریف، نەقیب ، فەرماندە ئەمیر**).

چەکیش بریتی بوو لە(**شمشێر، رم، قەڵغان، زوێ، سەرتاڵ، هەروەها تیرو کەوان**)،کەئەمە چەکی باوی سوپاکانی ئەو سەردەمە بووە.هەندێ چەکی تری وەکو **مەنجەنیق‌و تانک‌و نەوت** هەبووە بەڵام هەموو سوپایەک نەیبووە.

سوپای دۆستەکی تەنها لەکورد پێک نەهاتووە، بەڵکو ژمارەیەک جۆرجیەکان‌و تیپێکی هەزار نەفەری تورکمانە سەلجوقی‌یەکان لەناو ریزەکانیان خزمەتی کردووە.مامۆستای مێژوونوس پێی‌وایە کە سریان‌و ئەرمەن و عەرەب‌و دیانەکانیش لەناو سوپادا بوون، چونکە ناکرێ ئەوانەی لەگەڵ کوردا بەیەکەوە ژیابن بەشداری ئەرکی بەرگری کردن لەدەوڵەتیان نەگرتبێتە ئەستۆ، چونکە مێژوونووسان باسی ئەوە دەکەن کە مەسیحی‌یەکانی کوردستان لەداموو دەزگا کارگێڕییەکانی دەوڵەتدا رۆڵی بەرچاویان هەبووە.

سەبارەت بە ژمارەی هێزە چەکدارەکانی دۆستەکی زانیاری‌یەک لەبەردەست نی‌یە ئەوە نەبێ کە ئەو هێزەی بەسەرکردایەتی ((پاد)) لە ساڵی(٣٨٠ک) بەرامبەر (٩٩٠ز)شاڵاوی بردە سەر موصل لەشەش هەزار چەکدار پێک هاتبوو کەلە ریزی ئەو هێزەدا هێزە خۆبەخشەکانیش هەبوون.

(ب) **پۆلیس**: دەوڵەتی دۆستەکی لەپاڵ هێزە چەکدارەکانیدا هێزێکی پۆلیسی هەبووە کەهەڵساوە بە ئەرکی پارێزگاری کردنی ئاسایشی ناوخۆی شارەکان و رێگرتن لەتاوانکاری‌و دەستگیرکردنی تاوانباران‌و یارمەتی دانی دادوەر لە جێ بەجێ کردنی حوکمەکانی و یارمەتی دانی(محتسب)ئەگەر خواستبێتی.هەروەها یارمەتی دانی فەرمانبەری فەرمانگەی کۆکردنەوەی داهاتی دەوڵەت لە کۆکردنەوەی باج‌و شتی لەو جۆرە.

## ژیانی مرۆیی دەوڵەت

زۆر بەکورتی ئاماژەیەکی خێرای پێدەکەین:لەکاتێکدا زۆرینەی هەرە زۆری دانیشتوانی دەوڵەتی دۆستەکی کورد بوون، بەڵام لەپاڵ ئەم زۆرینە کوردی‌یەدا کەمایەتی نەتەوەیی‌و ئاینی تر هەبوون‌و بەم جۆرە:

١-سریان ٢- ئەرمەن ٣-رۆمە بیزەنتی‌یەکان

٤- عەرەب ٥- جوولەکە ٦-مەسیحی.

# ژیانی کۆمەڵایەتی

*نووسەر کۆمەڵگای کوردستانی ئەوکاتەی بەسەر سێ(چین)دا لە ڕووی ئابووری‌یەوە دابەش کردووە:*

**چینی دەوڵەمەند**: کەلەئەندامانی بنەماڵەی دۆستەکیو سەرکردەکانی سوپاو فەرمانبەرە گەورەکانی دەوڵەتو خاوەن موڵکەکان و دادوەرەکان و بازرگانە گەورەکان و هەندێ کەسایەتی زانستی پێکهاتوون.

**چینی مام ناوەند**: کە لەفەرمانبەرە بچوکەکانی دەوڵەتو بازرگانە بچووکەکانو جوتیارە خاوەن زەوی‌یەکان پێکهاتووە.

**چینی هەژار**: کە لەجوتیاران بەشێوەیەکی گشتی و توێژە کەم دەرامەتو خاوەن پیشە دەستیە بچوکەکان پێکهاتووە.

(دیارە ئەم ڕووەی ژیانی دەوڵەتی دۆستەکی لێکۆڵینەوەی تێرو تەسەلی زیاتری پێویستە).

## ئافرەتی کورد:

زانیاری شایەنی باس دەربارەی ژیانو دابو نەریتو جلو بەرگو ژیانی کۆمەڵایەتی ئافرەتی کورد لەو قۆناغەدا لەبەر دەستا نی‌یە. مەگەر تەنها ئەوەی پەیوەستە بەئەرکە ئیسلامی‌یەکانو ئەرکەکانی ناو خێزانی، بەڵام سەرەڕای ئەوە مێژوونوس وای بۆ دەچێت کە ئافرەتی کورد لە کۆمەڵگای دۆستەکی خاوەنی پایەو شوێنێکی کۆمەڵایەتی بەرزبووەو، جۆرێ لەئازادی‌هەبووەو بەشداری هەندێ کارو فەرمانی گرنگی کردووەو، هەندێ لەئافرەتانی بنەماڵەی دۆستەکیش دەستیان لە کاروباری فەرمانڕەواییەوە داوەو بەشداری بەڕێوەبردنی دەوڵەتیان کردووە.

کەکاتێ لەساڵی ٩٩٠ز ((باد))لەشالاوەکەی سەر شاری(موصلّ)دا کوژراو (ابی علـی)خوشکەزای بەخۆیو سوپا تێکشکاوەکەیەوە گەڕایەوە وڵات. خێزانی((باد)) کەخاڵی(ابو علی)بوو لەقەڵای(حسکیف)دا بوو ترسا لەوەی لێی هەڵگەڕێتەوە و قەڵاکە نەدا بەدەستەوە.بەڵام(ابی علـی)کاتێ داوای کرد قەڵاکەی تەسلیم کاتو یارمەتی تەسلیم کردنی شارەکانی تری بدات، لەبەرامبەر ئەمەوە ئەمیش مارەی بکاتو بەشداری فەرمانڕەوایی بکاتو لە بەڕێوەبردنی

دەوڵەتدا راوێژی پێ بکات، ئەویش بەمەرجەکانی رازی بوو.

هەردووکیان بەخۆیانو سوپایەکەوە ڕوویان کردە(میافارقین)ی پایتەختو چوونە ناویەکئو بەم جۆرە سەرجەم شارو قەڵاکانی تریان بێ هیچ یاخی بوونو شەڕو ئاژاوەیەک خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیان. بەمەش ئەم شارانە ڕۆڵێکی بەرچاویان بینی لەمەحکەم کردنی پایەکانی فەرمانڕەوایی(ابی علی)و پاراستنی دەوڵەت، هەروەها عەزیزی کچی زەنگ دوای مردنی(سەعیدی کوڕی نصر الدولة)ی میری لەساڵی(٤٦٤ک)دا خۆی جڵەوی بەڕێوەبردنی شاری دیار بەکری گرتە ئەستۆ، تادواتر میر(نظام الدین)خواستی.

## جەژنو بۆنەکان:

دۆستەکییەکانیش وەک گەلانی موسڵمانی دەوروبەریان لەجەژنو بۆنە ئیسلامییەکاندا ئاهەنگو خۆشییان دەربڕیوە.

هەروەها نووسەر باسی ئەوە دەکات کە *بەبۆنەی نەورۆزیشەوە ئاهەنگ گێڕدراوە چونکە نەورۆز سەری ساڵی دارایی دەوڵەتی عەبباسی بووەو ئاهەنگی بەبۆنەوە گێڕدراوە*، بەجۆرێ ئەودیاریانەی لەو ڕۆژەدا بۆ خەلیفەی عەبباسی چووە یەکێ لەسەرچاوەکانی داهاتی دەوڵەت بووە.

## هونەرە جوانەکان:

دۆستەکییەکان خاوەنی گۆرانیو هەڵپەرکێی تایبەت بەخۆیان بوون... گەرچی زانیاری دەربارەی جۆری گۆرانیو هەڵپەرکێو هونەرە جوانەکانی تری دۆستەکییەکان لەبەر دەستا نییە، بەڵام گومان بۆ ئەوە دەچێ بەشێ لەو گۆرانیو هەڵپەرکێیەی ئەمڕۆ لەماردینو دیاربەکرو شارەکانی تری ئەو دەوروبەرەدا هەیە ڕەگو ڕیشەیان بگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتە... لەکۆمەڵگای دۆستەکیدا ئامێری مۆسیقاو لەوانەش عود بەکار هاتووە، مەسیحییەکانیش بەبۆنەی بۆنەو جەژنەکانی خۆیانەوە ئاهەنگیان گێڕاوە، دانانی میری دۆستەکیش لەسەرکورسی فەرمانڕەوایی بۆنەیەک بووەو شا ئاهەنگی گەورەی بۆ گێڕدراوە.

## موڵکە دابڕکراوەکان (الاقطاع):

*سێ جۆر لەم موڵکایەتییە هەبوو:*

زیندووکردنەوەی زەوییە مردووەکان، ئەو زەوییانەی بێ خاوەنن و تا ئەوکاتە سودیان لێ وەرنەگیراوە.

دەوڵەت داویەتی بەهەندێ فەرماندەو کەسایەتی دەوڵەت بەجۆرێ تا مردن سوودی لێ وەربگیرێتو دوایی دەگەڕێتەوە بۆ دەوڵەت.

موڵکی دەوڵەت بۆ ماوەیەکی دیاری کراو داویەتی بەکەسێ بەرامبەر باجێ بیدات بە خەزێنەی دەوڵەت.

## ئایینەکان

*لەکوردستاندا لەپاڵ ئیسلامدا کە ئایینی ڕەسمی زۆرینەی گەل بووە سێ ئاینی تر هەبوون:* **١- مەسیحی ٢-جوولەکایەتی ٣-زەردەشتی**

١- مەسیحی یەکان: هەر لەسەدەی یەکەمی زاینیەوە مەسیحیەت لە کوردستانا بڵاو بۆتەو، بەڵام ئەوەی جێی سەرنجە ژمارەیەکی زۆر کەم نەبێ کورد نەبووە بەمەسیحی بەڵام نەتەوەی تری وەکو ئارامیو ئەرمەنی یەکان هەبوون کە شوێنەکەوتووی ئەم ئایینە بوون.

مەسیحیەکان لەسەر دەمی دەوڵەتی دۆستەکیەکاندا بەهۆی ئەو سیاسەتە ڕاستو دروستو ئیسلامیانەی دەوڵەت گرتبوونیە پێش بەتەواوی ئازاد بوون؛ بەجۆرێ لەو سەردەمەدا وێنەی کەم بووە دەرگای خزمەتکردنیان لەبەردەم واڵا بووەلەدەزگا جۆراو جۆرەکانی دەوڵەتو سوپاو تەنانەت وەکو وەزیری پادشای دۆستەکیش دەوریان بینیوە.. وەک هاوڵاتی یەک ڕێزیان گیراوەو مافەکانیان پارێزراوە.

٢- جوولەکایەتی: لەدەوڵەتی دۆستەکیدا کەمایەتی یەکی جولەکە هەبووەو لە(میافارقین)ی پایتەختیشدا گەڕەکێ بەناوی ئەوانەوە بووە ئەمانیش مێژوو شتێکمان بۆ ناگێڕێتەوە بەڵگە بێ لەسەرنەوەیدەست درێژی کرابێتە سەر مافو ئازادییان(چونکە حوکمی ئەمانیش لەشەریعەتی ئیسلامیدا حوکمی مەسیحیەکانەو ئیسلام سەربەستی ئاینی بۆ بڕیارداونو پارێزگاری لێ دەکات).

٣- ئاینی زەردەشتی: بەڕای نوسەر لەو سەردەمەدا ئاینی زەردەشتی لەدەوڵەتی دۆستەکیدا هەبووەو شوێنکەوتوانیشی کەم نەبووە، هەروەکو پێی وایە ڕیشەی یەزیدییەکانی ئەمڕۆی کوردستان دەگەڕێتەوە سەر ئاینی زەردەشتی[1].

---

(١) لەدوا چاوپێکەوتنێکم لەگەڵ نووسەردا ئەوەی ڕوون کردەوە کە ئێستا ئەوەم لاساغ بۆتەوە کە یەزیدی یەکانناچنەوە سەر زەردەشتی یەکان بەڵکو زەردەشتی یەکان دژایەتیشیان کردوون. درێژەی ئەو بابەتە لای مامۆستا نووسراوە.

# ژیانی ئابووری

گومانی تێدانییە کە کوردستانی ناوەڕاست لەسەردەمی دەوڵەتی دۆستەکیدا پێشکەوتنێکی گەورەی ئابوری لە بوارەکانی کشتوکاڵو پیشەسازی و بازرگانی بەخۆیەوە بینیوە بەجۆرێک بەبەراورد لەگەڵ ئەو سەردەمەدا دەتوانین ناوی بنێین (ڕاپەڕینی ئابووری) هۆی یەکەمی ئەم گەشەسەندنەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ئاسایشو ئارامیەی دەوڵەت فەراهەمی کردبوو. کەبە هەرچی بۆی بکرایەو بەهەموو شێوەیەک هەوڵی دەدا خۆی لە شوێنەوارە کاولکاریو وێرانیەکانی جەنگ دوور بخاتەوە.

لەپێش ئەوەدا بەهۆی ئەو دوژمنایەتیە قوڵەی نێوان بیزەنتییەکانو حەمدانییەکانەوە هەمووجارێ سوپای کاولکاری بیزەنتی کەبەسەر کوردستاندا دەکشا شارو گوندێکی زۆری لەگەڵ خۆیدا خاپورو وێران دەکرد. کێڵگەو مەزرا کشتوکاڵییەکانی تیا دەبردو ئەم بارە ناهەموارەش ژیانی ئابووری پەک دەخست.

بەڵام سەردەمی دۆستەکی تەواو پێچەوانەی ئەو سەردەمەی پێش خۆی، وڵاتی لە خاپوربوون ڕزگار کردو ئارامیو ئاسایش باڵی بەسەردا کێشا.

دوای قۆناغی کۆتاییهاتنی دامەزراندنی دەوڵەتو دارشتنی پایەکانی لەساڵی (٣٨٣ک) ەوە بیگرە تا ساڵی (٤١٧ک) واتە بۆماوەی (٣٥) ساڵی ڕەبەق هیچ شەڕو پێکدادانێک لەدەوڵەتی دۆستەکیو دەوڵەتو میرنشینەکانی دراوسێیان ڕووینەداوە هەروەها لەساڵی (٤٢٧ک) بۆ (٤٧٦ک) واتە لەماوەی (٤٩) ساڵ بێجگە لەدەست درێژییەکەی دەوڵەتی (عقیلی) هیچ دەست درێژییەکی وانە کراوەتە سەر دەوڵەت کە شوێنەوارێکی خراپی وا بەجێ بێڵێ کار لەژیانی ئابووری خەڵکەکە بکات.

بەم سەقامگیرییە کە هیچ دەوڵەتو میرنشینێکی تری ناوچەکە بەخۆیەوە نەبینیوە بووە هۆی ئەوەی دانیشتوانی دۆستەک لەباتی سەرقاڵ بوون بەشەڕو شۆڕو جەنگو کوشتارەوە ڕووبکەنە کاری کشتوکاڵیو پیشەسازیو بازرگانیو ئاوەدانی. ئەوەش بووە هۆی گەشەسەندنی ئابووریو بەرزبوونەوەی ئاستی گوزەران، لەڕاستیدا دەوڵەتی دۆستەکی ژیانێکی نوێی لەکوردستاندا بنیات نا.

(فارقی) مێژوونوس زۆر جار ئاماژە بەو خۆش گوزەرانیو بەختەوەرییە دەکات کە گەلی دۆستەک هەیبووە ئەوەتە دەڵێ: (خەڵکی لەسەردەمی ئەودا

واتە(نصر الدولة) دەوڵەمەندوو بێنیاز بوون. بەڕاستی ئەو ڕۆژانە باشترینو دەوڵەتەکەشی باشترین دەوڵەت بوو)بەهۆی ئەو گەشەکردنی ئابووریيەوە زۆر لەبازرگانو خەڵکیوڵاتانی تر ڕوویان کردۆتە پایتەختی دەوڵەت و سەرگەرمی کارو کاسپی و بازرگانی بوون.

یەکێکی تر لەو شتانەی ئاماژە بەم پێشکەوتنە ئابوریيە دەکات وتەکەی(ابن الجوزي)یە کە لەپانۆرامای ژیانی(نصر الدولة)ئەحمەدی کوڕی مەرواندا دەڵێ ( لەسەردەمی ئەودا نرخی کەلو پەل هەرزان بوو.خەڵکی بەماڵو سامانەوە خۆیان دەردەخست،واتە بوونە خاوەنی ماڵو سامان).(إبن أثير)یش هەر هەمان شت دەڵێ ل ٢٧٦ .

بەهۆی ئەو پێشکەوتنەی کوردستانی ناوەڕاست لەسایەی فەرمانڕەوایی دەوڵەتی دۆستەکیدا لەبوارەکانی ئابووریو کۆمەلایەتیو سیاسیدا بەخۆیەوە بینیهەروەها لەبواری ئارامیو ئاسایشو بوارەکانی تردا..(ابن کثیر)ی مێژوونوس دەڵێ:(وڵاتی دۆستەکی ئاسایشترین و خۆشترین لاتی سەردەمی خۆی بووە هەروەها لەهەموو شوێنێ زیاتر دادپەروەریی لێ پیادە کراوە)ل ٢٨٧.

## کشتوکاڵ:

پێش سەردەمی دۆستەکییەکان باری ئابووری کوردستانی ناوەڕاست بەگشتی و کشتوکاڵ بەتایبەتی ڕووەو ڕوخانێکی گەورە ڕۆیشتووە بەجۆرێ هەرسێ چاخەکەی دوای هاتنی ئیسلامی پێش خۆی باری وای بەخۆیەوە نەبینیبوو *ئەویش بەهۆی دوو هۆکاری سەرەکیەوە:*

١- **شاڵاوە یەک لەدوای یەکەکانی ڕۆمە بیزەنتییەکان بۆ سەر ئەم بەشەی کوردستان** بەتایبەتی ناوچەکانی دیار بەکرو فارقینو غەرزان و ماردین. ئەم شالاوانە دەبوونە هۆی کوشتنو ماڵ لێ تێکچوونی جوتیاران و تیاچونی باخو مەزرا کشتوکاڵیەکان.

٢- **خراپی سیاسەتی حەمدانییەکان.**

بەلام لەسەردەمی دۆستەکییەکاندا بەهۆی سیاسەتە سەرکەوتووەکانیان لەهەردوو ڕوی ناوخۆییو دەرەکییەوە وەسیاسەتە دادپەروەرانەکەی بەرامبەر جوتیاران و توێژەکانیتر کەباری قورسی باجی گرانیان لەسەر شان لابرا؛ لە

مێژوی فارقیدا لە زۆر شوێندا باس لەباشبوونی ژیانو گوزەرانی جوتیاران دەکات.وەک دەڵێ (نصر الدولة) لەهەموو تەمەنی فەرمانڕەوایەتی خۆیدا کە زیاترلە(٥٠)ساڵ درێژەی کێشاوە ستەمی لەیەکێ نەکردووە .درهەمێکی لەیەکێ نەسەندووە، تەنهادەست بەسەراگرتنی ماڵو سەردەمی(ابن جری)بازرگان نەبێ، هەروەها وەک دەست گرتن بەسەرا پارەیەکی زۆریلە(ابن علي بن البغل)ی دادوەر سەند.

هەروەها ئەو هەرزانیو خۆش گوزەرانی‌یەی کەلەمەو پێش ئاماژەمان بۆ کردو مێژونووسان تۆماریان کردوە.

ئەم پێشکەوتنە لەبواری کشتوکاڵو بوارەکانی تردا جیگای شانازی (نظام الدین)ی پادشای دۆستەکی بووە. شانازی بەزۆری جوتیارانو باغو باخات وکێڵگەو خێرو بێری ولاتەکەیو ئاوەدانی خاکەکەی کردووە. ئەم شانازیو شادمانیەی بۆ(ابن الهجاء)میری هەولێر دەربڕیوە. کەسوڵتانی سەلجوقی ناردبووە لای(نظام الدين)بۆ ئەوەی سی هەزار دیناری بۆ بنێرێت.

میری هەولێر وای گومان دەبرد پادشای دۆستەکی ئەم پارەی ناداتێ بەمەش دەبێتە جێی خەشمو تورەیی سوڵتان. بەلام پادشای دۆستەکی وتی:*اکورم ئاوەدانی ولاتەکەم و خێرو بێرو باخو بێستانی زۆرو زەوەندە و زۆریی جوتیاران نابینی؟ وادەزانی هەموو ئەم شتانە لەبەر خاتری(٣٠)هەزاردینار تیا دەبەمو دەفەوتێنم؟*ل٢٨١

جا لەڕۆژی چوارەمی دیدارەکەیدا بڕی دیاری کراوی پێدا.

نووسەر لەلاپەڕەکانی دواتردا باس لە میوەی ئەوکاتەی ئەم بەشەی کوردستان و گرنگترین مەڵبەندە کشتوکاڵی‌یەکانی دەوڵەت دەکات.

**پیشەسازی:**

لەبەر ئەو هۆکارانەیبۆ پیشکەوتنی ژیانی ئابوریمان نووسی. پیشەسازیش پێشکەوتنی بەخۆیەوە بینی لەو پیشە دەستیانەی باوبووە، پیشەسازی چنینی خوری ولۆکەو دەستەسڕو..هتد هەروەها پیشەسازی وشک کردنەوەی ماسیو دروستکردنی تەرازوو ،قوفڵو، قاپو قاچاغو بۆنو بەرامە .

دیار بەکر هەندێ بەرهەمی پیشەسازی جلو بەرگی ڕەوانەی دەرەوەی دەکرد.چنینی حەریر لەدیار بەکر زۆر باوبووە.

لەو پیشەسازییانەی تر کەلەو سەردەمەدا هەبووە پێستە خۆشکردن، دروستکردنی ئاوی گوڵ، دروستکردنی دەرگای ئاسنین بڕانکو چۆغە.صابون، پێڵاو، قاپو قاچاغی لەمس دروست کراوە.یەکێ لەپیشەسازییە گرنگەکانی دەوڵەت ڕاو کردنی ماسی دەریاچەی وانو خوێ کردنیو، وشک کردنەوەی بووە کە سەرچاوەی دەرامەتی خەڵکێکی زۆر بووە بەڕێژەیەکی بەرچاو نێردراوەتە دەرەوە.

تەنانەت ماسی نێردراوی دەریاچەی وان گەیشتۆتە وڵاتی ئەفغانستانی ئەمرۆ هەروەها گەیشتۆتە هند.

## پیشەسازی میکانیکی:

ئەوەی لە پیشەسازی میکانیکی دەوڵەتی دۆستەکی پێمان گەیشتبێ کە ئیش بەجوڵەی ئامێرو ڕەورەوەی بازنەیی جولاو ببەستێ بریتی بووە لە:

١) ئەو دۆلابەی کە(نصر الدولة) لەسەر ڕوباری(باطمان) دروستی کردووە بۆ هەڵکێشانی ئاو بۆ شاری تازەی کەبەناوی(النصرية)ەوە دروستی کردبوو.

٢) کاتژمێری گەورە:کاتژمێرێ بوو کە(نصر الدولــة)لەمزگەوتی گەورەی (فارقین)دا دروستی کردووەو بۆ سەردەمی خۆی شتێکی نایاب بووە.گومان بۆ ئەوە دەبرێ ئەو کاتژمێرە کاتژمێرێکی گەورە بووبێو بەئامێری میکانیکی ئیشی کردبێ.

شوێنەواری سەعاتێکی هەتاوی تاسەرەتای سەدەی بیستەمیش بەسەر مزگەوتە کۆنەکەی فارقینەوە مابوو، کاتژمێرەکە بریتی بوو لەخانوویەک لەسەرمزگەوتەکە دروست کرابوو داونزە دەلاقەی هەبوو هەر یەکەیان بۆ دیاری کردنی سەعاتێکی ڕۆژ تەرخان کرابوو تاساڵی ١٩٠٧ ئەرمەنەکان کاولیانکرد ل٣١٠.

ئەشێ ئەمە پاشماوەی ئەو کاتژمێرە(بەنکام)ە بێ کە پادشای دۆستەکی کاتی خۆی دروستی کردووە.

نووسەر دوای باسی پیشەسازی دێتە سەر باسی کانەکان، ئەو کانانەی کەلەکوردستاندا هەبوون و سوودیان لێوەرگیراوە وەک مسو تەنەکەو مەگنیسیۆمو.هتد هەروەها باسی کێشانەو پێوانە دەکات لەگەڵ ئەو کێشەرو پێوەرانەی بەکارهاتوون.

**بازرگانی:**

*لەسەردەمی دەوڵەتی دۆستەکیدا جموجوڵی بازرگانی پێشکەوتنێکی بەرچاوی بەخۆوە بینی بەهۆیچەندان هۆکا رلەوانەش:*

١) گرنگی دانی دەوڵەت بەدروستکردنی پەیوەندی برایانەو دۆستانە لەگەڵ دەوڵەتو میرنشینەکانی ناوچەکەو خۆ دوورخستنەوە لەململانێ لەگەڵ دراوسێکانیداو پەیڕەو کردنی ئاشتیو دۆستایەتی وەک ستراتیژیەتی سیاسەتی دەرەکی خۆی لەناوچەی ئیسلامییو مەسیحیدا.

٢) سەقامگیرکردنی ئارامیو ئاسایش لە ولاتدا. ئەو ڕێگا بازرگانیەی ولاتیان دەبەست بە ولاتانی ترەوە؛ دووربوون لەڕێگریو چەتەیی و ڕوتکردنەوە کە ئەمەش متمانەی بازرگانەکانی زیاتر دەکردو زۆرتر دڵنیای دەکردن.

دەتوانین ئەو بایەخەی دەوڵەتی دۆستەکی دابووی بەپاراستنی ئاسایشی بازرگانەکان لەم ڕووداوەدا بەدی بکەین کە(نصر الدولة)یەکێ لەسەرۆکە کوردەکانی دەوڵەتەکەی کوشت دوای ئەوەی دانی بەوەدا نا لە کاتێکدا لەتافی لاویدا ڕێگربووە بازرگانێکی ڕووت کردۆتەوەو دوای بەتاڵان بردنی ماڵەکەی خۆشی کوشتووە.

(نصر الدولة)(قصاص)ی ئەو بازرگانە کلۆڵە نەناسراوەی دوای تێپەڕبوونی سالانێکی دوورو درێژ سەندل ٣٢٢

## ژیانی ڕۆشنبیری

ڕۆشنبیری لەسەردەمی دەوڵەتی دۆستەکیدا گەشەسەندنێکی بەرچاوی بەخۆیەوەبینی بەهۆیئەو بایەخەی کە دەوڵەت بەڕۆشنبیریو بلاوکردنەوەی زانیاری دەدا هەروەها ئەو لالیکردنەوە گرنگی پێدانەی زانایان ویاسا ناسانی ئیسلامیی و ئەدیبان و شاعیران و پزیشکانی گرتبۆوە.

ئارامی باری ئاسایشی ولاتو گەشەسەندنی ئابووری ولات بووبووە زەمینەی گەشەسەندنە ڕۆشنبیریەکەلەبەر ئەوە شارەکانی(فارقین)ی پایتەخت و جزیرەو تەنزەو شاتان وئەرزن بەدلیس و زۆر شار،مەڵبەندی تربوو بەمەڵبەندی زانستو شوێنی کۆبوونەوەی زانایان و پزیشکان و پێگەیاندنی زاناو کەسانی شارەزا.

ئەم بزوتنەوە رۆشنبیرییە بەجۆرێ بوو بووە جێگای چاوتێبڕینی زانایانو، قوتابیانی زانست لەدەرەوەی وڵات ڕوویان لەمەڵبەندە زانستییەکانی کوردستانی ناوەڕاست دەکرد یەکێ لەو مێژوونووسانەی ئاماژەی بەمە کردووە (ابن الأثیر)ە کەدەڵێ:(نصر الدولة مەبەستو رووگەی زانایانی زۆر گۆشەو کەناری جیهانی ئیسلامیی بووە)ص ٣٤٩.

(ابن الجوزی)یش دەڵێ:(شاعیرانو زانایان و زاهیدان ڕوویان لەنصر الدولە دەکردو لای دەگیرسانەوە)ص ٣٤٩

کوردستانی ناوەڕاست لەسەردەمی دەوڵەتی دۆستەکیدا پەیوەندییەکی رۆشنبیری بەهێزی بەبەغدای پایتەختی عەبباسییەوە هەبووە. هەروەها پەیوەندی ڕۆشنبیری بەشامو میصرەوە هەبووە.

زۆر لە قوتابیان بۆ تەواو کردنی خوێندنەکەیان لەسەر دەستی غەزالیو ئەبی ئیسحاقی شیرازیو ابن الصباغ و زۆر گەورە زانای تری موسڵمان لەسەدەی پێنجەمی کۆچیدا ڕوویان دەکردە بەغداد لەوانەش(ابوبکر الشاشي الفارقي) کە یەکێ لەگەورە زانایانی شافعی بووە.ناوو ناوبانگی زانستی فارقی بلاوبۆوەو تابووبەمامۆستای قوتابخانەی(النظامیة)ی بەغدا کەلە بەناوبانگترینو گەورەترین قوتابخانەکانی بەغداد بوو.چەندان دانراوی هەیە لەوانەش(الشافي شرع الشامي)لە بیست بەرگدا نووسەر ناوی چەندان زاناو شارەزای تر دەبات کە بەرجەستەی ئەم پەیوەندییە رۆشنبیریەیان کردووە.سەرەڕای ئەمە زانایانی کوردستان بۆ چارەسەرکردنی مەسەلە فقهیە ئاڵۆزەکان پشتیان بەزانایانی بەغداد بەستووە .وەک ئەو مەسەلانەی لەلایەن زانایانی(فارقین)ەوە بۆ(القاضي أبي یعلي بن الفراد – محمد بن الحسین)لە بەغداد نێردراوە.ص٣٥٥

**فیقه:**

لە پێش سەردەمی دەوڵەتی دۆستەکیدا فقهی ئیسلامیی خوێندراوەبەلام لەسەر یەکێ لەچوار مەزهەبە بەناوبانگەکە نەبووە ، بەڵکو بەشێوەیەکی تێکەڵ خوێندراوەو هەر زانایەک ئەگەر شوێنکەوتەی یەکێ لەو مەزهەبە فقهییانە بووبێ زیاتر گرنگی پێداوە.تاکو نیوەی یەکەمی سەردەمی دەوڵەتی دۆستەکی هیچ مەزهەبێ لە کوردستان جێگیر نەبووە.نووسەر پێی وایە هەموو مەزهەبەکان لەکوردستاندا ناسراون.(مقدسی)ئاماژەی بەبوونی مەزهەبی حەنەفیو شافعی

کردووه.مەزهەبی حەنبەلیش بەپلەیەکی کەمتر لەهەرێمی جزیرەدا هەبووه.ل٣٥٦

کوردستان مەزهەبەکانی ئەوزاعی و داودیو سوفیانی سەوری ناسیوه.مەزهەبی سوفیانیلەشاری دینەوەر کە گەورەترین مەڵبەندی زانستی کوردستانی ڕۆژهەلات بووه لەناستێکی بەربلاودا بلاوبۆتەوه. ئەبوبەکری کوڕی عبدالغفاری کوڕی عبدالرحمانی دینەوەری(٤٠٥ک-١٠١٤ز) دوایەمین کەس بووه کە لەمزگەوتی (منصور)لەبەغداد بەگوێرەی مەزهەبی(سفیان الثوري)فتوای داوه.ص٣٥٦

دادگاش تانیوەی یەکەمی سەردەمی دەوڵەت پەیڕەوی لەمەزهەبێکی فقهی دیاری کراو نەکردووەودادوەر خۆی پەیڕەوی لەهەر مەزهەبێ کردبێ بەگوێرەی ئەو حوکمیداوه.

یاخود دادوەر خۆی ئیجتهادی خۆی کردووه، بەلام لەنیوەیکۆتایی دەوڵەتدا مەزهەبی پێشەوا شافعی دەسەلاتی پەیدا کردو لەسەر ئاستی کوردستاندا بلاو بۆوەو جێگیر بوو.

ئەمەش بەهۆی ئەو قوتابخانە فقهیە شافعیەی کەلە(میافارقین)ی پایتەختدا کرایەوه کە(ابوعبداالله محمد بن بیان بن محمد الکازرونی)ڕێبەرایەتی دەکرد یەکەم جار مەزهەبی شافعی لەهەرێمی دیار بەکر بلاو بۆوه.مەلا عەبدوڵلای کازەرونی زانایەکی گەورەی کورستانی ناوەڕاست بوو کەکەم زانا شانی دەدا لەشانی بەهۆی هەوڵەکانی ئەم قوتابیو هاوکارانیەوه مەزهەبی شافعی بەکوردستاندا بلاوبۆوەهەر بەهۆی هەمان قوتابخانەی فارقینەوه ڕێبازی ئەشعەری لە کوردستاندا تەشەنەی کردووه.نووسەر ناوی چەندەها زانای ناوداری دەوڵەتی دۆستەکی تۆمار کردووه.

## تەجوید:

زانستی تەجویدیش وەکو زانستێ لەدەوڵەتی دۆستەکیدا خوێندراوه و جێگای بایەخی زاناو قوتابیانی زانست بووه. زۆر جار لەپاڵ شاعیرەکاندا ناوی قورئان خوێنەکان براوەئەوانەی لەم زانستەدا یان زانابوون یان بەرەچاو کردنی بنەماکانی قورئانیان خوێندووه وەک(أبي البرکات)ی زانا کە زۆر شارەزای ئەم زانستە و جۆرەکانی خوێندنەوەی قورئان بووه.

نوسراوه مێژوویەکان وا دەردەخەن کەزانایەکی شارەزای ئەم زانستە لە

میسرەوە ڕووی کردۆتە وڵاتی دۆستەکی ولەسەر دەستی ئەو قوتابیانە فێری زانستەکە بوون.

**ئەدەب:**

ئەدەب لەدەوڵەتی دۆستەکیدا بایەخێکی زۆری پێ دراوە. دیارە دەقی ئەدەبی بەکوردی نەبووە چونکە یەکەم شاعیرێ بەکوردی شیعری وتبێ بابا تاهیری هەمەدانییە، کە هەرچەندە هاوچەرخی دەوڵەتی دۆستەکی بووە بەڵام لەکوردستانی ڕۆژهەڵاتدا ژیاوە.

کوردستان وەک سەرجەم وڵاتە موسڵمان نشینەکان بەعەرەبی بووە بەو سیفەتەی زمانی قورئان بووە لەبەر ئەم راستییە ئێمە ناتوانین ڕەخنە لە دەوڵەتی دۆستەکی بگرین کە بۆ ئەدیبە کوردەکانی هەڵنەناوە بەکوردی بنووسن وشیعر بڵێن.ئەگەر هاتوو بەچاویلکەی ئەو سەردەمە سەیری واقیع بکەین.ل ٣٦٣

**پزیشکی:**

دەوڵەتی دۆستەکی لەپاڵ گرنگی دانیدا بە ژیانی ئابووریو ئاوەدانی وڵات گرنگی بەزانستەکان داوەو لەوانەش زانستی پزیشکی، هانی پزیشکانی داوە بۆ چارەسەری نەخۆشی و گرتنەوەی دەرمانو نووسین لەبواری پزیشکیدا.

گرنگی دانی زۆری دەوڵەت بەپزیشکان وای کردووە هەندێک لەدەرەوەی کوردستانەوە ڕوو بکەنە وڵات. دەوڵەت لەسەردەمی(نصر الدولة)دا نەخۆشخانەیەکی گەورەی لەپایتەختدا کردەوە کە لەسەر پێشکەوتووترین شێوازی نەخۆشخانەکانی ئەو سەردەمە بووەو کەلو پەلو ئامێرو دەرمانە ناسراوەکانی ئەو کاتەی بۆ دابین کراوە.

دەوڵەت سوودی لەشارەزاییە پزیشکییەکانی ئەو سەردەمە سائیسلامیی بووبن یاخود مەسیحی بینیوە. نووسەر دواتر باس لە دامەزراندنی نەخۆشخانە گەورەکەی فارقین دەکات.

**قوتابخانەی پزیشکی:**

نەخۆشخانەکەی فارقی بەشێکی تایبەت کرابوو بەخوێندنی پزیشکی کە نووسەر بە قوتابخانەی پزیشکی ناوی بردووە. هەروەها بەکۆنترین قوتابخانەی پزیشکی کوردستانی داناوە.ئەو کاتە هەر وەک چۆن زانستەکانی(فقه)و فەرموودەو تەفسیرو زانستەکانی زمانی عەرەبی لەمزگەوتەکاندا دەخوێندرا

چونکە قوتابخانەی سەربەخۆ بۆ خوێندنی ئەو بابەتانە بووە- هەروەها زانستی پزیشکیش لەنەخۆشخانەکاندا خوێنراوە.(نظام الملك)ی وەزیری ئەلپ ئەرسەلان پادشای سەلجوقی یەکەم کەس بوو کەلەنیوەی کۆتایی سەدەی پێنجەمی کۆچیدا قوتابخانەی سەربەخۆی دروست کرد. قوتابخانەیەکی زۆری لە ولاتدا کردەوە سالانە(٦٠٠)شەش سەدهەزار دیناری لە پێناو بلاو کردنەوەی زانستدا خەرج دەکرد.ص٣٨٤. تەنانەت قوتابخانەیەکیشی لەشاری جزیرە دروست کرد.کەبەمانا راستەقینەکەی کۆنترین قوتابخانەی کوردستانە؛ لەوە ئەچێ کاتێ بنیاتی نابێ کەلەگەڵ ئەلپ ئەرسەلان لەسەردەمی دەوڵەتی دۆستەکیداو لەساڵی(٤٦٣ک-١٠٧٣ز)هاتووە بۆ کوردستان.

قوتابخانە پزیشکیەکەی فارقین گومانی تیانییە دەورێکی گەورەی بینیوە لەپێگەیاندنی پزیشکو بلاو کردنەوەیان بەکوردستاندا شایەنی باسە لەقوتابخانە پزیشکییەکەی(فارقین)دا وەك قوتابخانە ئیسلامییەکانی هاوچەشنی خۆی لەو سەردەمەدا خوێندن تیایدا بەهەردوو شێوەی نەزرەیو عەمەلی بووە.کاتێ قوتابی ماوەی خوێندنی تەواو کردووە تاقی کراوەتەوەو سوێندی خواردووەو بڕوانامەی پێ دراوە.بەلام لەهەڵسان بەئەرکەکانیاندا بەردەوام لەژێر چاودێری دەوڵەتدا بوون، پزیشکەکانی نەخۆشخانەوقوتابخانە پزیشکییەکەی فارقین لەپاڵ هەڵسانیان بە چارەسەرکردنی نەخۆشەکان رۆڵێکی بەرچاویشیان لەدانانی کتێبی زانستی پزیشکیدا هەبووە.بۆنموونە نووسینی کتێب لەسەر چۆنیەتی ئامادەکردنو گرتنەوەی دەرمان. هەروەها چۆنیەتی رێکخستنی نەخۆشخانەو هەندێ نەخۆشی وەکو نەخۆشی چاوو شێوەی چارەسەرکردنی و ناوی نەخۆشییەکان و هەروەها باسکردنو مەسەلە سێکسییەکان لەڕووکاری تەندروستییەوە.هتد. نووسە رباس لەوە دەکا کە ناوی ئەو پزیشکانەی سەردەمی دەوڵەتی دۆستەکی دەستی کەوتوون زۆربەیان مەسیحین دواتر کورتەیەك لەژیانی چەند پزیشکی ئەو سەردەمەی باس کردووە.

## کتێبخانەکان؛

وادەردەکەوێت کە دەوڵەتی دۆستەکی بایەخی بەدامەزراندنی کتێبخانە داوە بۆئەوەی زانایان لەلێکۆڵینەوەکانیاندا سوودیان لێ وەربگرن و بتوانن نوسخە لەبەر کتێبەکانیان بگرنەوە..هەروەها بۆ ئەوەی بشبێ بەبەشێ لە ڕواڵەتی

ڕۆشنبیری و ژیانی لەوڵاتدا.

لەو سەردەمەدا کوردستان چەندان کتێبخانەی تیابووە کە ڕەشنوسێکی زۆری لەزانستی جۆراو جۆردا تێدا بووە، لەوانەش کتێبخانەی دیاربەکر کە ئێستا بە(UIUCAMI)ناسراوە.

هەروەها کتێبخانەی فارقین ئەم دوو کتێبخانەیە تا حەفتاکانی سەدەی(٦ک-١٢ز)بە ساغی مابوونەوە لەوەش دەچێ ئەو کتێبخانەیکە(صلاح الدینی ئەیوبی)لەساڵی(٥٧٩ک-١١٨٤ز) لەدیاربەکر دەستی بەسەرا گرتووە(١٫٠٤٠٫٠٠٠ )یەک ملیۆنو چل هەزار بەرگ کتێبی تیابووە کوردستانی ناوەڕاست تەنیا ئەو دووکتێبخانەیەی تیا نەبووە بەڵکو کتێبخانەی زۆری تیا بووە، تەنانەت هەندێ لەکەنیسەو دێرەکانیش کتێبخانەی خۆیان هەبووە سوودیشی لێ وەرگیراوەوە یەکێ لەو کتێبخانە دەوڵەمەندانە کتێبخانەی(قەرتەمین)ی یەعقوبی بووەکە لە ڕۆژهەڵاتی ماردیندا بووەو کتێبی زۆری تیا بووەو لەلایەن قەشە مارشیلیۆنەوە بەڕێوە براوە.

## هونەری بیناسازی و نەخش و نیگار

نووسەر لەسەرەتاوە ئاماژە بەوە دەکات کە زوربەی شوێنەوارەکانی دەوڵەتی دۆستەکی تیا چوونو نەماونو، بەڵام هەندێکی تاکو ئێستاش بەنەمری ماونەتەوەو لەبەر چاوانن.

دیارە لوتکەی هونەری بیناسازی دۆستەکی لەکۆشکە چوار نهۆمیەکەی پادشای دۆستەکیدا بەرجەستە بووە. کە مێژوونوسان باس لەنەخشو نیگاری نایابیکردووە لەناو پایتەختیشدا ئاوێنەیەکی گەورە لەسەر ربورجێ بۆ ڕازاندنەوەی شارەکە دروست کراوە.مزگەوتی گەورەی(فارقین)یش کە (نصر الدولة ) ساڵی(٤١٤ک-١٠٢٥ز) تازەی کردەوە نموونەی هونەری بیناسازی بوو ئەویش بەو پایەو نەخشو نیگارەی لەمزگەوتەکەدا بووە هەروەها مزگەوتەکەکاتژمێرێکی گەورەی بەناوی(بەنکام)تێدا بووە کەکاتی خۆی (نصر الدولة) دروستی کردووە نووسەر واگومان دەبات کە ئەو مزگەوتە مزگەوتی(صلاح الدین)ی ئێستایە کە شوێنەواری هونەری بیناسازی زۆر نایابی تێدایە.

سبری کونیادی مێژوونوس دەربارەی ئەو کاتژمێرە گەورەی ناو مزگەوتەکە دەڵێ : لەهەرەسەرەوەی مزگەوتەکەدا خانووێ هەبوو کە کاتژمێرە هەتاویەکە بوو ، ئەم خانووە بەناوبانگە (١٢) دەلاقەی تێدابووە هەریەکەیان تایبەت بووە بەدیاری کردنی سەعاتێکی دیاری کراو تیشکی ڕۆژ لەهەر سەعاتێکدا لەدەلاقەیەکی دەدا.

جا دەڵێ بەداخەوە ئەرمەن کەلافی ئەوەیان لێ دەدا ئەم خانووە لەدەستکردی خۆیانە سالی (٣٢٥ك-٩٠٧ز) خاپوریان کرد ،کەواتە وەك دەردەکەوێت شوێنەواری ئەم کاتژمێرە مەزنە تاسەرەتای ئەم سەدەیەش هەر ماوە.

نووسەر باس لەوە دەکات کەوەستاو پیشەگەرەکانی کوردستان دەستێکی باڵایان لەدروستکردنی دەرگای جۆراو جۆری ڕازاوەدا هەبوو، یەکێ لەو دەرگا بەناوبانگانەش دەرگایەکی مسی کۆشکەکەی پادشای دۆستەکی بووە.

نووسەر باس لەهەندێ شێوازی بیناسازی ئەو سەردەمە دەکات وەکو (سەدلی) کە دروستکردنی سێ گومەزەی بەیەکدا چوو بووە لەیەك خانوودا ، هەروەها هونەری (ئەزج) کە جۆرێ بووە لە جۆرەکانی هونەری بیناسازیو بریتی بووە لە خانوویەك کەسەقفێکی چەماوەیهەبووە.لە هونەرەکانی تری بیناسازی دۆستەکی هونەری دروستکردنی گومەز بووە بۆ مەبەستی جۆراو جۆر.

دەست ڕەنگینی ئەندازیارە کوردەکانی کوردستانی ناوەڕاست لە دروست کردنی زۆرشت وەکو قەڵا جۆراو جۆرەکانو پردو شورای شارەکان و منارەی مزگەوتەکاندا دەردەکەوێت لەچەشنی قەڵای بەدلیسو هەودەخو شورەی دیار بەکرو مزگەوتی گەورەی شارو، ئەو شارە بەردینە هەڵواسراوەی کەلەسەر چوار پایەی بەردین دامەزراوەبوەپردی(باطمــان)کە لەڕووی ئەندازەییەوە پردێکی تریهاو وێنەی لەهەموو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا چنگ ناکەوێت هەروەها گومەزی(قەڵات)و قوتابخانەی یاقوتیو خاتوونی لە ئەرزەڕۆمو قوتابخانەی(زنجیرەی)لە ماردین..ئەندازیارو بیناسازی کورد لەدەرەوەی کوردستانیشدا جێ دەستیان دیارە لە نیوەی کۆتایی سەدەی یانزە داو لەسەردەمی دۆستەکیدا خەلیفەی فاتمی-المستعلي- پشتی بەسێ برای

بیناسازی کوردی شاری(اورفای)ی هەرێمی دیار بەکر بەست بۆ تازەکردنەوەی سێ دەروازەی شورای شاریقاهێرەو هەریەکەیان ـ ەرگایەکیان تازە کردەوە.

بازارو مزگەوتەکانی دروست کردۆتەوە و بزوتنەوەی بازرگانی تێبردۆتەوە،دەبێ ئەوەش بوترێ ئەم هەڵمەتی ئاوەدانکردنەوە کەلەساڵی(٤٤٠ك)بووە تەنها مەڵبەندی شاری(ماردین)ی نەگرتۆتەوە، بەڵکو گوندەکانی دەوروبەریشی گرتۆتەوە.

لەپرۆژەکانی تری دەوڵەتی دۆستەکی دروست کردنی نەخۆشخانەی (فارقین) و تازەکردنەوەی مزگەوتی گەورەی ئەو شارەیە، هەروەها دروستکردنی منارەی مزگەوتی(المحدثة)کە مزگەوتێ بووە کەوتۆتە دەرەوەی شورەی شارو تازە کردنەوەی خودی مزگەوتەکە ،وەدروستکردنی میوانخانەو مزگەوتێك لە نزیك گوندی(تل بنان)وە میوانخانەو مزگەوتێك لەنزیك گوندی(باطري) هەروەها گەرماوێ لەدەشتی شورجات،هەموو ئەم پرۆژانەش لەسەردەمی(نصر الدولة)دا بنیات نراون.

هەر لەسەردەمی ئەودا سێ جۆگای ئاو بۆ پایتەخت ڕاکێشرا،(نظام الدین)ی پادشاش ئاوێنەکەی پایتەختو قاتی چوارەمی کۆشکی پادشایەتی دۆستەکی دروست کرد ،هەروەها (نصر الدولە)پردێکی بەسەر ڕوباری(الحو)دروستکردووە.

ساڵی(٤٥٧ك)(نظام الدین)ی پادشا پردێکی گەورەی لەسەر ڕووباری دیجلە لای شاری دیار بەکر دروستکرد کەتاکو ئێستاش ماوەویانزە پایەی هەیەو نووسراوێکی کوفی پێوەیەو کەلەدەقەکەیدا هاتووە:(خەرجی کێشانو فەرمانکردن بۆ دروستکردنی ئەم پردە لەلایەن گەورەو خاوەن شکۆمان..(نظام الدین) سەروەری ئیسلامەوە بووە..)

لە پرۆژەکانی تری دەوڵەت دروستکردنی مزگەوتێ بوو لەدیار بەکرو ساڵی(٤٤٧ك)تا ئێستاش ئەم مزگەوتە بەمزگەوتی(بنی مروان)ناسراوە، بەشێکی خاپوور بووە بەڵام بەشێکی تری هەر ماوە،لەپرۆژەکانی تر دروستکردنی(قوبە)یەك لەناوەندی(عین زعور)دا،کەلەناو شاری دیار بەکردایەو(ممهد الدولة) دروستی کردووە.

## دامەزراوە بەرگەرییەکان:

دەوڵەتی دۆستەکی هەستاوە بەدروستکردنی دامەزراوەی جۆراوجۆری بەرگری

بۆنەوەی لەکاتی جەنگودەستدرێژی دەرەکیدا بتوانن پارێزگاری لە خۆیـان بکـەن وەک دروست کردنی قەڵاو سەنگەرو بورجو شورە.

جا لەبەر ئەوەی کوردستانی ناوەڕاست لەسەردەمی حەمدانی یەکاندا کەوتۆتە بەرشالاوی یـەک لـەدوای یـەکی بیزەنتی یـەکان، زۆربـەی دامو دەزگـا سـەربازیو بەرگرییەکان خاپوور بوون یاخود بەکەڵکی سوود لێوەرگرتن نەماون.

پێویستی بەوە کردووە چاک بکرێتەوە لەبەر ئەوە کـاتێ دەوڵـەتی دۆسـتەکی دامەزرا خۆی لەبەردەم ئـەرکێکی قورسـدا بینییـەوە،کـە ئـەویش دروسـتکردنو چاککردنـەوەی دامو دەزگـای بـەرگری جـۆراو جـۆر بـوو لەوانـە شـورەی شـاری(فـارقین)،(فـارقی)مێژوونـووس باسـی ئـەوەدەکات کـە هـاتبوو بـەلاداو خەریک بوو هەرەسی دەهێنا بەڵکو کاتێ دەوڵەت دامەزرا بەشێکیشـی لێڕوخـا بـوو. لەبـەر ئـەوە دەوڵـەت ناچـار بـوو سـەر لـەنوێ بینـای بکاتـەوە هـەروەها دروستکردنەوەو چاککردنی شورەی دیار بەکر.

لەدامەزراوە بەرگرییەکانی تری دەوڵەت دروستکردنی قەلایەک بوو کە(نصر الدولة) لەسنوری سەناسنەئەرمەنەکاندا دروستی کردبوو،کە بایەخێکی ستراتیژی زۆری هەبووە بۆ بەربەستکردنی شالاوی سەناسەکان.

## شوێنەوارە ئاوەدانیەکان (الآثار العمرانية)

دەوڵەتی دۆسـتەکی هەڵسـاوە بـە دروسـتکردنی چـەندەها پـرۆژەی ئـاوەدانی لەوێنەی شارو کۆشکو تەلارو میوانخانـەو خـانو تەکیـەو گـەرماوو مزگـەوتە پردو جۆگاو شورەو قەلاو دیوار.

باسی هەندێ لەو پرۆژە ژیاریو شارستانیانەی کوردسـتانی ناوەڕاسـتمان پـێ گەیشتووە.

### شاری (نصرية):

پادشای دۆستەکی (نصر الدولة) لە رۆخی رۆژهەلاتی رووباری (باطمان) کـە دیمەنێکی جوانو دڵڕفێنی هەیە بەتایبەتی لەوەرزی بەهاردا شاری (نصريـــة)ی دروستکرد کە بەناوی نازناوەکەی خۆیەوە ناوی ناوە.

(نصــر الدولــة) بەهارانی ژیانی لەم شارە خنجیلانەدا بەسەر دەبرد، (فارقی)مێژوونوس ئەم شارە بەیەکێ لە پرۆژە مەزنەکانی دەداتە قەڵەم، ئەم شارە پارەیەکی زۆری تێدا خەرج کراوە.

وادەردەکەوێ دوای رووخانی دەوڵەتی دۆستەکیو لەسەردەمی سەلجوقیدا شارەکە بەرەو دواکەوتن چووبێو، دوایی بووبێ بەگوند یاخود هەر بەتەواوی نەمابێ.

**ئاوەدانکردنەوەی شاری ماردین:**

دەستی ئاوەدانکردنەی دەوڵەت گەیشتۆتە زۆر ناوچەی وڵات، لەپاڵ ئەو راپەرینە ئابووریو کۆمەڵایەتیەی وڵاتدا ڕاپەرینێکی ئاوەدانکردنەوەی فراوانیشی بەخۆوە بینی، لەنیشانەکانی ئەم ڕاپەرینەش ئاوەدانکردنەوەی شاری خاپوری ماردین بوو..(عبد السلام الماردینی)ی مێژوونووس باسی ئەوە دەکات کە ماردین تاسەد ساڵەی دوای هاتنی ئیسلامیش ئاوەدان بووە، بەڵام دواتر بۆماوەی نزیکەی سێسەد ساڵ کاولو وێران بووەو کەسی تیا دانەنیشتووە، تا(نصر الدولة)ی دۆستەکی دوای (٧٠)حەفتا ساڵ لەدامەزراندنی دەوڵەت بۆ جارێکی تر ئاوەدانی کردەوە. ❑

تێبینی

ئەم کتێبە بەزنجیرە لەژمارەکانی (١٤٧ تا ١٦٠)ی ڕۆژنامەی یەکگرتوودا بڵاو کراوەتەوە

# پێرست

مؤسسة روشنبير للطبع والنشر
مشروع طبع ( ١٠٠ ) كتاب كوردي
رقم ( ٢٥ )

# الــــدولة الدوستكية في كوردستان الوسطى

تأليف : عبد الرقيب يوسف
ترجمة : ابو بكر علي



له بڵاوكراوه‌كانی كتێبخانه‌ی ڕۆشنبیر
سلێمانی - بازاڕی ڕاپه‌ڕین

چاپخانه‌ی وه‌زاره‌تی په‌روه‌رده/هه‌ولێر